﴿ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِي
وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴾

(إبراهيم: ٣٥)

# بەرگریکردن لەخاکی موسوڵمانان
# گرنگترین فەریزەی سەرشانی موسوڵمانانە


دانانی زاناو سەرکردەی موجاهید:

شەهید د. عبدالله عەزام

خوا لێی خۆش بێت

پێداچوونەوەی لەسەر دەستی

زانای پایە بەرز عبدالعزیز بن باز

بۆ کراوە خوا لێی خۆش بێت

وەرگێرانی

ئیمام عبدالله (ئەبو صەفوان)

تەخریجی فەرموودەکان

لەسەر پەرتوکەکانی زانای فەرموودە ناس شێخ محمد بن ناصر الدین الالبانی کراوە

خوا لێی خۆش بێت

پێشەکی بۆ کراوە لەسەر دەستی زانایانی پایە بەرز

عمر سیف | سعید حوی

عبدالله ناصح علوان | محمد نجیب المطیعي



لە بڵاوکراوەکانی سایتی گزنگ

www.gizing.net

# پێشکەش بێت

بە هەموو ئەو مسوڵمانانەی لە خەمی ڕزگارکردنی وڵاتانی ئیسلامییدان.

ناوی کتێب بەکوردی: بەرگریکردن لە خاکی موسوڵمانان گرنگترین فەڕیزەی سەرشانی موسوڵمانانە

ناوی کتێب بە عەرەبی: دفاع عن أراضي المسلمين أهم فروض الأعيان

وەرگێڕانی: أبو صفوان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١٣

نۆبەی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٨٦٨)ی ساڵی ٢٠١٢ی دراوەتێ.

چاپخانەی شارستان - سلێمانی

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا...

زۆر دەمێکە کتێبخانەی کوردی پێویستی بە کتێبێکی لەم جۆرەیە، تا خوێنەرانی کورد زوبان و لاوان بەتایبەتی ئەو ڕێسا و یاسایانەی تایبەتە بە بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران و ئازادکردنی خاکی مسوڵمانان شارەزا ببن و بزانن بەرەنگاربوونەوەی ملهوڕو داگیرکەران تەنها بە چەك و قوربانیدان دەبێت وەك سەرکردەیەکی موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (جدر المزلة لا تدك ... بغير زخات الرصاص والحر لا يلقى القياد... لكل الكافر والعاصي وبغير نضح الدم... لا يمحي الهوان عن النواصي).

واتە: بنەچەی سەرشۆڕی لا ناچێ بەبێ شریقەی فیشەك، مرۆڤی سەربەخۆ ملکەچ نابێ بۆ هەموو کافرو یاخیبوویەك، بەبێ خوێنڕشتنیش ڕسوایی لە ناوچاوان ناسڕێتەوە.

د. عەبدوڵڵا عەززامیش (ڕەحمەتی خوای لەسەربێت) سەرکردە و زانایەکی مەیدانی بوو، هەر وشەی ریزنەکردووە لەبەر سپیلتدا، بەڵکو کەسێکی دڵ زیندوو بوو، لەگەڵ وتەکانی زانایانی پێشوودا بۆچوونی (الرأي) خۆشی هەبووە و نووسیویەتی.

ئەم کتێبەش لە بڵاوکراوەکانی سایتی (گزنگە) خوا پاداشتی خێریان بداتەوە، منیش لەسەر پێشنیاری برایەك بڕیارمدا چاپی بکەم.

بەڵام چەند هەڵەیەك لە تەرجەمەکەیدا هەبوو، لەگەڵ هەڵەیەك لە تەفسیری ئایەتی (التوبە: ٥) و (مریم: ٥٩). زۆر هەوڵمدا وەرگێڕەکەی بدۆزمەوە و قسەی لەگەڵ بکەم و هەڵەکانی پیشان بدەم، بەڵام نەمدۆزیەوە، ناچار منیش بە ڕاوێژکردن بە برای بەڕێزم (مامۆستا عبدالحسیب) چاکم کردو ئامادەی چاپم کرد.

داواکارم لە پەروەردگار ئەم بەرهەمە و بەرهەمەکانی ترمان بۆ بکاتە بەرچاوڕوونی زیاتری لاوان و خەرمانی کردەوە چاکەکانمانی پێ قورستر بکات بۆ ڕۆژی قیامەت، من و خوێنەریش بکاتە سەربازێکی ون بۆ ڕزگارکردنی خاکی مسوڵمانان لە داگیرکەران و نۆکەر و ئەڵقە لەگوێکانی.

ئێوەش لە دوعای خێرتان برای ناساغتان بێ بەش مەکەن.

سەردار عبدالرحمن

پرۆژەی باشترین هاوڕێ

١٠ صفر ١٤٣٤

٢٠١٢/١٢/٢٣

بسم الله الرحمن الرحیم

خوای گەورە (عزوجل) لە سورەتی (التوبة)دا دەفەرموێت: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (التوبة: ٤١) واتە: هەموو تان پێکەوە (پیر و گەنج، ئازا و ترسنۆك، دەوڵەمەند و هەژار) بەماڵ و سامان، بە دڵ و بە گیان، لە ڕێی خودا دەربچن و جیهاد بکەن، ئەوە خێرترە بۆ تان (جیهاد) کردن لە دانیشتن و مانەوەتان، ئەگەر بزانن و تێ بگەن، یان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن لەگەڵ خوای گەورەدا.[١]

١) ئایا شەر و تێکۆشان لە ئەفغانستان و فەڵەستین و وڵاتانی دیکەی (عێراق و صۆمال و مەغریب)[٢] و جگە ئەوانی دیکەش لە خاکی موسوڵمانان کە ڕوو بە ڕووی داگیر کردن و ئیستعمار بوونەتەوە فەڕزی کیفایەتە یان فەڕزی عەینە ؟

---

[١] ) ئەم ئایەتە ساڵی ڕووداوەکەی جەنگی تەبوك نازڵ بوو، خوای گەورە فەرمانی دا بە گشت موسوڵمانان کە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەڕێ بکەون و بچنە غەزا دژی سوپای ڕۆمەکان، ئەم فەرمانەش فەرمانێکی براوە و حەتمی بوو، خۆلادان و پێچو پەنا نەبوو لێی ...

[٢] ) تێبینی: شێخی تێکۆشەر عبدالله عەزام: ئەم کتێبە موبارەکەی کاتی جەنگی یەکێتی سۆڤیەت نوسیبو، ئەو کات تەنها خاکی (ئەفغانستان و فەلەستین و لوبنان و فلیپین و کشمیر) و چەند شوێنێکی دیکە شەرو کوشتاری تێدا بوو، بەڵام ئێستا جەنگەکە فراوان بووە و وڵاتانی دیکەی وەك: (عێراق و صۆمال و یەمەن و شام و مەغریب و باکستان و شیشان و تورکستان) و چەندەها وڵاتی دیکەی موسوڵمانان ڕوو بەرووی داگیر کاری و شەرو کوشتار بۆتەوە لەلایەن بێ باوەڕانەوە، کە جاران تەنها (ڕووسیا و ئیسرائیل) ڕاستەوخۆ ڕۆڵی شەرەکەیان دەگێڕا، بەلام ئێستا (ئەمریکاو بەریتانیا) و وڵاتە گەورەکانی ئەورووپاش هاتونەتە مەیدانەوە بۆ شەرو کوشتاری ئوممەتی ئیسلامی و داگیرکردنی خاك و ئاویان و بەتاڵانبردنی ماڵ و سەروەت و سامانیان ... ئێمەش لێرەدا و لەپاڵ قسەکانی شێخدا ئەو وڵاتانەی کە سەرلەنوێ داگیر کراونەتەوە لە پاڵ ئەوانەی داگیر کراون لە کەوانێکدا نوسیومانن، هەتا خوێنەر وا تێنەگات تەنها ئەو وڵاتانەی کە شێخ ناوی نوسیون تەنها ئەوانەن کە پێویستە موسوڵمانان بەرگری یان لێ بکەن، یان دەبێت جیهاد تەنها لەو وڵاتانەدا بکرێن.

٢) ئایا بەراستی دەکرێت لەم ڕۆژگارەدا موسولمانان بەیەك جار دەربچن و نەفیر.[٣] بکەن و ڕوو بە ڕووی دوژمنان و داگیر کەران بوەستنەوە ؟

٣) ئایا دەکرێت بە گیان و ماڵ جەنگ و جیهاد بکەین و پێشەوا (قائید)ێکیش مان نەبێت ؟

٤) ئایا دەکرێت لە ئەفغانستان و (عێراق و فەلەستین و غەیری ئەوانیش) جەنگ و جیهاد بکەین لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوا و قادەکان جیاواز و پەرتەوازەن؟

٥) ئایا موسوڵمان بە تەنها دەجەنگێت ئەگەر خەڵکی دانیشتن و پشتیان لە جەنگ و جیهاد کرد ؟

٦) ئایا ئەگەر ئێمە لاواز بووین دروستە بە ناچاری پەنا بەرینە بەر کوفار و بێ باوەران و (ئیستیعانە) یان پێ بکەین ؟

٧) ئایا شان بە شانی ئەو موسوڵمانانە جەنگ و جیهاد بکەین کە ئەزمونێکی خوازراو یان نییە لە پەروەردەدا ؟

٨) ئایا لە ئەفغانستانەوە دەست پێ بکەین یان لە فەڵەستین و (خاکە داگیر کراوەکانی دیکە) وە ؟

ئەم پرسیارە سەیر و سەرنج ڕاکێشانە کە ئێستا لە زەین و خەیاڵدا دێن و دەڕۆن، و خەڵکیش لە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنیان جیاوازن، وە هەموو بەپێی تێگەیشتن و ئیجتیهادی خۆی وەڵامی هەیە بۆی، ئێمە بە ئیزنی خوا، لەم پەرتوکەدا بە داڕشتن و بەڵگە و تێگەیشتنێکی شەرعیانە تێکرا لەسەر وتە و تێگەیشتنی زانا و فوقەهاکان و شەرع ناسە گەورەکانی ئەم ئوممەتە وەڵامیان دەدەینەوە...

[٣]) تێبینی: نەفیر : واتە دەرچوون و ڕاپەرین ڕووبە دوژمن بە شەڕو کوشتار کردن دژیان...

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا...

## پێشەکی عبدالله عەزام

کاتێك ئەم فەتوام نوسیبو زۆر لەم قەبارە گەورەتر بوو، پاشان بردم بۆ فەزیلەی شێخی گەورەمان سەماحەتی شێخ (عبدالعزیز بن باز) و بۆیم خوێندەوە، وە ئەویش پشتگیری کرد و فەرمووی: (هذا طيبة). پاشان ڕەزامەندی و پشتگیری خۆی لەسەر پیشاندا، بەڵام ئەوەبوو پێشنیاری کرد بۆم، کە پوختە (موختەصەر)ێکی لێ دابنیم هەتا ئەویش پێشەکی (موقەدیمە)یەکی بۆ بنوسێت و پاشان بڵاوی بکەینەوە، ئەوەبوو منیش کورتەیەکم لەسەر دانا، بەڵام تەواوی کاتەکانی شێخ (ئیبن باز) زۆر چڕو بێ دەرفەت بوو، چونکە کاتی مەراسیمی بەڕێوە بردنی حەج بوو، ئیتر لەبەر ئەو هۆکارە دەرفەت نەبوو جارێکی تر کتێبەکەی بۆ بەرمەوە [٤]

پاشان شێخی پایە بەرز (ئیبن باز) بۆخۆی لە مزگەوتی (ئیبن لادن) لە (جدە) و (الجامع الكبير) لە (رياض) فەتوای دەرکرد، کە ئەمڕۆ جەنگ و جیهاد بە گیان و ماڵ فەرزی عەینە، پاشان ئەم فەتوام جگە لە (٦) پرسیارەکانی کۆتایی، پیشانی زانایانی پایە بەرز، شێخ: عبدالله عەلوان و شێخ سەعید حەوا و، محمد نجيب المطيعي و دکتۆر حسين حامد حەسان و عومەر ئەلسەیف دا و، بۆیانم خوێندەوە، و ئەوانیش ڕەزامەندی خۆیان

---

[٤]) زانای پایە بەرز (عبدالعزیز بن باز) ڕەحمەتی خوای لێ بێت نابینا بوو، چونکە هەردوو چاوەکانی لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا لە خزمەتی عیلم و شەرعدا دانا، ئەگەر هەرکەس کتێبێکی بۆ ببردایە، دەبوا خۆی یان کەسێکی تر بۆی بخوێندایەتەوە

لەسەر دەربڕی و زۆربەیان ئیمزا و خەتمی خۆیان لەسەری کرد، وە هەروەها بۆ شێخی پایە بەرزیش (محمد بن صالح العثيمين)م خوێندەوە و، ئەویش ڕەزامەندای خۆی لەسەر پیشاندا و ئیمزای خۆی لەسەر کرد، هەروەها بەهەمان جۆر زانایانی پایە بەرز (عبدالرزاق عفیفی و حسن ئەیوب و دکتۆر احمد ئەلعەسال) فەتوایان لەسەر داو پشتگیریان کرد ...

پاشان بۆخۆشم لە وتارێکدا و لە (مینا) و لە سەنتەری هۆشیاری گشتی لە حەجدا، بەرزم کردەوە، کە لەو کاتەدا زیاتر لە (١٠٠) سەد زانای تەواوی ولاتانی ئیسلامی لەو شوێنە کۆ ببونەوە و ئامادە بوون، منیش لەو وتارەدا پێم ووتن: ((إتفق السلف والخلف وجميع الفقهاء والمحدثين في جميع العصور الإسلامية؛ أنه إذا اعتدي على شبر من أراضي المسلمين أصبح الجهاد فرض عين على كل مسلم ومسلمة، بحيث يخرج الولد دون إذن والده، والمرأة دون إذن زوجها)). واتە: تەواوی پێشینان (سەلەف) و(خەلەف) و تەواوی فوقەهائو فەرمووده ناسان، لە هەموو چاخەکانی ئیسلامیدا هەموو پێکەوە لەسەر ئەوە پێك هاتوون و کۆرا و یەك دەنگن، کە ئەگەر بستێك لە خاکی موسوڵمانان دەست درێژی کرایە سەری، ئەوە جەنگ و جیهاد دەبێتە فەڕزی عەین لەسەر تەواوی هەموو موسوڵمانانی نێر و مێ، بەو جۆرەی کوڕ بەبێ پرس و ڕوخسەتی بابی و ئافرەت بەبێ پرس و ڕەخسەتی هاوسەرەکەی، دەچن بۆ جەنگ و جیهاد)). وە من لێرەدا و لە بەردەم ئەمیری موجاهیدەکان، (سەیاف) بڕیار ئەدەم، کە لەماوەی ژیانم لەگەڵ جیهادی ئەفغانیدا بۆ ماوەی (٣) ساڵ، دەڵێم جەنگ و جیهادی ئەفغانی پێویستی بە پیاو (رجال) هەیە، ئێوەش ئەی زانایان (علماء) ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەر ڕەخنەو پێشنیارێکی هەیە با قسە بکات، بەڵام هیچ کام لە زانایان قسەیان نەکرد، بەڵکو شێخ ئیدریس فەرمووی: (یا أخي هذا الأمر لا خلاف فيه). واتە: ئەی برام ئەو شتە هیچ خیلاف و جیاوازییەکی تێدا نییە)).

لە پێناو ئەمەدا ئەم فەتوام چاپ کرد، داوام وایە لە خوای گەورە، سوود بەخش مان بکات پێی لە هەردوو دونیادا، وە تەواوی موسوڵمانانیش لێی سوود مەند بن....

عبدالله عزام

## وتەی شێخ عومەر سەییف

بسم الله الرحمن الرحيم

برای خۆم (فی الله) شێخی پایە بەرزی راستگۆ و تێکۆشەر، دکتۆر عبدالله عزام، ئەم فەتوا گەورە و ئامۆژگارییە بەنرخەی پیشاندام لە بارەی جەنگ و جیهاد و حوکمی جیهاد، وە ئایا کەی جیهاد فەرزی عەینە، وە منیش هەموویم خوێندەوە، بینیم ئەم پەرتوکە هەق و صەوابە و هیچ پێچو پەنایەکی تیا نییە، وە هەرکەس زەرەیەك ئیمان لە دڵیدا هەبێت بەم بەڵگانە تەسلیم دەبێت کە شێخ باسی کردوون، لە کیتاب و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و تێکرا و ئیجماعی زانایان (علماء)....

دەڵێم: هەوڵدان بۆ بەدەمەوە چوون و یارمەتی و نەفیر بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەریزەیە ناوەستێت، مەگەر ئەو کەسانە نەبن کە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ ﴾ (محمد: ٢٠).

خوای گەورە پاداشتی شێخ عبدالله بداتەوە چاکترین پاداشت، بە نیيەت و ئاگا بوونی، وە هەمووومان بۆ رەزامەندی خۆی مۆفەق بکات ...

والحق أن الجهاد الآن فرض عين ولا إذن لأحد.

الفقير إلى الله عمر سيف

صنعاء ٢٨ /١٢/١٤٠٤هـ جدة

مجلس كبار العلماء، اليمن

## وتەی مامۆستا سەعید حەوا

بسم الله الرحمن الرحيم

پاش گوێ بیست بوونم لەم نامەی برامان شێخ عبدالله عەزام، من بە فەتوایەکی تەواو و پوخت و بە پێزی دەزانم، وە دانی پێدا دەنێم لەوەی تێدا هاتووە و ، ڕەزامەندی خۆم لەسەری پیشان دەدەم و بانگەوازی بۆ دەکەم ...

سعيد حوى

## وتەی شێخ عبدالله علوان

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد قائد الغر المحجلين، وعلى آله وأصحابه الذين حملوا راية الجهاد في ربوع العالمين، وعلى قادة الحق، ودعاة الخير بإحسان إلى يوم الدين.

وبعد:

شێخ عبدالله عزام خوا بیپارێزێت لەم نوسراوەیدا کە لە بارەی حوکمی جەنگ و جیهاد لە ئەفغانستان و فەلەستین و جگە لە وانیش لە خاکی ئیسلام، نیشانی دام هەتا بیخوێنمەوە و هەڵی بسەنگێنم، منیش بە تەوفیقی خوای گەورە دەڵێم :

هەموو ئەوانەی کە نوسیونی و فەتوای لەسەر داون، لە زانایان و پێشەوایانی سەلەف و خەلەفی وەرگرتووە و هێناوییەتی لەم نوسراوەدا، وە هەمووی راستن، چونکە هەر وڵاتێکی ئیسلامی کافر و بێ باوەران داگیری بکەن -وەك زانایان بریاریان لەسەر داوە- جەنگ و جیهاد و ڕووبەڕو بوونەوە و شەڕ کردن دژی ئەو داگیر کەرە فەرز دەبێت لەسەر هەموو دانیشتوانی ئەو خاکە، ئافرەت بەبێ پرس و ڕوخسەتی هاوسەرەکەی و کوڕ بەبێ پرس و ڕوخسەتی باوکی، دەچن بۆ ئەو جەنگ و جیهادە، ئیتر بەو جۆرە جەنگ و جیهاد

دەبێتە فەرزی عەین، لەسەر هەموو ئەو شار و دێیانەی کە نزیکن لەو خاکەوە، هەتا ئەو خاکە ئیسلامی یە ڕزگار دەکرێت، لە دەستی کافران و بێ باوەران، خۆ ئەگەر ئەو ڕێژەیە نەچووە جێی فەرزی یەتەکە، واتە ئەگەر سەرکەوتوو نەبوون و ئەو خاکە بەو ڕێژە ڕزگار نەکرا کە بۆی کۆبونەتەوە، ئەوە ئەو فەرزی یەتە درێژ دەبێتەوە بۆ سەر هەموو ئەو شوێنە نزیکانەی دیکە لەو خاکە داگیر کراوەوە، خۆ ئەگەر بەوانەش تەواو نەبوو، یان هەر کەم بوون و بێ دەسەلات و کەمتەرخەم بوون بەرامبەر ئەو دوژمنە داگیر کەرە، ئەوە جەنگ و جیهاد و بەدەمەوە چوونی ئەو خاکە لەسەر تەواوی دانیشتوانی زەوی فەرز دەبێت، کە بچن بەدەم نوصرەت و سەرخستنی ئەو گەل و خاکەوە، هەتا دوژمن دەشکێ و دەدۆڕێت و، دەردەکرێت لە خاکی ئیسلام و موسوڵمانان....

ئێستاش لەم زەمانەدا دەبینین زۆربەی موسوڵمانان لە تەواوی ولآتانی ئیسلامی کەم تەرخەم و خەم سارد و دانیشتوون لە هەق و مافی خاکی ئەفغانستان و فەلەستین و غەیری ئەوانیش لە خاکە داگیر کراوەکانی ولآتی موسوڵمانان (وەك عیراق و صومال و مەغریب و ئەوانی دیکەش)، بۆیە ئەمرۆ جەنگ و جیهاد فەرزی عەینە، لەسەر هەموو کەسێك کەلەسەر خاکی موسوڵمانان و ئیسلام نیشتەجێ بێت، چونکە پێویستی و پیاو (رجال) بەشی خۆی ئامادە نەبووە ....

لەسەر ئەمەش، ئەمرۆ فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێك کە توانای هەڵگرتنی چەکی هەیە بڕوات بۆ جەنگ و جیهاد، بۆ یارمەتی و بەدەمەوە چوونی برایانی موسوڵمانی لە ئەفغانستان و هەموو شوێنەکانی دیکەی دونیا و ولآتانی ئیسلامی، هەرچەندە و با دایك و باوکیشی ئیزن و روخسەتی نەیەن، هەر دەبێت بڕوات، هەتا پێویستی و کیفایەتی ئەو کارە جێبەجێ دەبێت (حتی تتحقق الکفایە)....

عبداللە ناصح علوان

جامیعەی مەلیك عبدالعزیز

جدە

## وتەی شێخ محمد المطيعي

بسم الله الرحمن الرحيم

فإن الجهاد في سبيل الله طلبا للشهادة التي بشر الله بها من اصطفاهم لها بقوله تبارك وتعالى: ﴿ويتخذ منكم شهداء﴾ إنما هو انتقال من دار إلى دار ومن حياة ضيقة إلى حياة أخرى مطلقة، ومن حياة النكد والغش والخداع والنهب إلى حياة السعادة والبلهنية والرضوان.

في هذه العجالة التي كتبها الأخ الكريم المجاهد العريق الدكتور عبد الله عزام حاضا على الجهاد، ومبصرا به، ناهجا النهج الصحيح بإعطاء الأمر حظه الوافر من الفقه والحديث والتفسير مناقشا ومستدلا بحجج هي شجى في حلوق الخالفين وقذى في عيون الجبناء والمنافقين، أقول فيها من الدعوة إلى السبيل الذي لا سبيل غيره في هذه الآونة الحرجة لرفع الحرج عن الأمة، والذود عن الملة، وإنما هي في الجملة حياة واحدة، فلتكن في سبيل الله ورسوله وكتابه وأمته لتكون أشرف وأرفع، وأبقى وأدوم، وإنما يجاهد المؤمن في الله جهاده، إن أخفق فإفادة أو أوذي فإرادة، أو نفي فريادة، أو سجن فعبادة، أو عاش فقيادة، أو مات فشهادة، فله الحسنى وزيادة.

وسلام على الذين سمعوا النداء فلبوا ((وإذ استنفرتم فانفروا)) ورحمة الله وبركاته.

محمد نجيب المطيعي

جدة، ناحية شارع الجهاد

خادم السنة بالأسانيد العالية

وصاحب تكملة المجموع شرح المهذب

وعضو اتحاد الكتاب في جمهورية مصر العربية

# بەرگریکردن لەخاکی موسوڵمانان

# گەورەترین فەرزەی سەرشانی موسوڵمانانە

إن الحمد لله نحمده ونستعنه ونستغفره ونتوب إليه ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله صلى الله عليه وسلم، وعلى آله وصحبه أجمعين.

وبعد:

خوای گەورە بە رەحم و بەزەیی خۆی ئەم ئاینەی هەڵبژارد هەتا ببێتە مایەی رەحمەت و بەرەکەت و خۆشی بۆ هەموو جیهان، وە سەییدی نێردراوانی نارد (صلى الله عليه وسلم) هەتا بیکاتە کۆتا نێردراو و پێغەمبەر بەم ئاینە، وە ئەم ئاینەی بە شمشێر (سەیف) و (سینان) نێزە سەر خست، پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە بەڵگە و بەیان بە خەڵکی راگەیاند، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **((بُعِثتُ بالسَيفِ بَينَ يَدَي الساعَةَ حَتى يُعبَدَ الله تَعالى وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَجُعِلَ رِزقي تَحتَ ظِلِ رُمحِي وَجُعِلَ الذُلَ والصَغارَ على مَن خالَفَ أمري، وَمَن تَشَبَهَ بِقَومٍ فَهوَ مِنهُم)).**[٥] واتە: من نێردراوم بە پێغەمبەری خوا، کە هەتا دوا رۆژ بە شمشێر (سەیف) جەنگ و جیهاد و

---

[٥]) صحيح: رواه احمد في المسند برقم (٤٩٤٤) و (٤٥٨٩) عن عبدالله بن عمر بن الخطاب القرشي، و رواه الطبراني في (مسند الشاميين) برقم (١٢١١) ، و رواه البيهقي في (شعب الايمان) برقم (١١٩٨) ، و رواه (ابن شيبة) برقم في (المصنف) برقم (١٩٠٠٦) و (١٩٠٤٢) و (٣٢٣٦١)، و رواه الطحاوي في (المشكاة الاثار) برقم (١٩٨) ، و رواه أيضا الامام (ابن المبارك) و (خطيب البغدادي) في كتاب (الجهاد) و (الفقيه والمتفقيه) عن طاوس بن كيسان اليماني، وأيضا عن انس بن مالك بن نضر بن ضمضم البخاري، برقم (٧٥٨)، و (١٠٤)، و صححه الالبانى رحمه الله في (صحيح الجامع الصغير للسيوطي) برقم (٢٨٣١) و (مشكاة الفقر) برقم (٢٤) و (صحيح الجامع الصغير) برقم (٢٨٢٨) وقال الالبانى وهذا حديث صحيح و رجاله كلهم ثقات، و صححه شيخ المحدثين احمد شاكر المصري في تخريجه لكتاب مسند امام أحمد بن حنبل رحمهم الله تعالى أجمعين ....

کوشتار بکەم، هەتا خوای گەورە بە تەنها بپەرسترێت و شەریکی بۆ بڕیار نەدرێت، واتە هەتا بە تەواوەتی تەوحید و یەکتا پەرستی لەسەر ڕووی زەوی بەرقەرار دەبێت و حوکم هەر بۆ خوای گەورە دەبێت، وە ڕزق و ڕۆزیشم بۆ کراوەتە ژێر سێبەری نێزە (رمح)ەکەمەوە، واتە (فەیئو غەنیمەت)، وە هەرکەسیش پێچەوانەم بکات لەم کارەدا و لەم ڕێگای من لابدات، تەنها ڕیسوای و زەلیلی بۆ دەمێنێتەوە، هەرکەس خۆی بچوێنێت بە هەر گەل و هۆزێکی دیکەوە، ئەویش لەوانە، واتە لەمن نییە.

حیکمەتی کارەکانی خوای گەورە بەو جۆرەیە کە، ئیصلاح و چاکسازی زەوی لەسەر بنەمای (دەفع) بێت، واتە هەموو کات کۆمەڵێك لە خەڵکانی یەکتاپەرست (موەحید) و شوێن کەوتەی هەق، ڕووبە ڕووی شوێن کەوتووانی (شیرك) و ناهەق و باطل ببنەوە و، ڕایان بماڵن و لەناویان بەرن، لەسەر ئەمەش چیرۆکەکەی سوپای (طالوت) و (جالوت) کە خوای گەورە لە قورئاندا لە بارەیانەوە دەفەرموێت بەڵگەیەکی ئاشکرایە: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ البقرة: ٢٥١ واتە: ئەگەر خوای گەورە هەندێك لەو خەڵكە بێ باوەڕەی بە کۆمەڵێك بەندەی خۆی لەناو نەبردایە، ئێستا ئەم زەوییە فاسید و وێران دەبوو، بەڵام خوای گەورە فەزڵ و چاکەی بەسەر گشت جیهانەوە هەیە.

زانایانی تەفسیر وەك ئیبن عەباس (خوایان لێ ڕازی بێ) و غەیری ئەویش دەفەرموون:

أي كما دفع بداود شر جالوت عن بني إسرائيل، ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ البقرة: ٢٥١ بأهلها، دفع الله بالنبيين عن المؤمنين شر أعدائهم، وبالمجاهدين عن القاعدين بالجهاد شر أعدائهم ولولا ذلك لفسدت الارض بأهلها.

واتە خوای گەورە فەزڵی داوە بەسەر مرۆڤەکاندا بەوەی کە ئەم یاسای (دەفع)ەی بۆ داناون، یان بە شێوازێکی دیکە، ململانێی نێوان هەق و باطل، لە پێناو چاکسازی و

ئیصلاحی مرۆڤایەتی و، وەرگرتنەوە و سیادەی هەق و بلاو کردنەوەی خێرو چاکە، بەڵکو جگە لەمانەش تەنانەت دروشم و شەعائیرەکانی پەرستش و بەندایەتی لەسەر ئەم یاسا و پێوەرە خوایی و رەبانییە وەستاوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ (الحج: ٤٠) واتە: ئەگەر خوای گەورە هەندێك خەڵكی بە هەندێكی دیكە پاڵ پێوە نەنایە و، فەرمانی بە جەنگ و جیهاد نەکردایە، هەرچی پەرستگای (روهبان)ەکان کە لای نەصاراکان پێی دەڵێن (دیر) و، (بییەع) کەنیسەی یەهودی یەکان و، (صلوات) ماڵە ئاگرینەکانی مەجوسییەکان و، (مسجد) مزگەوتەکان کە ناوی خوایان تێدا دەبرێت، وێران دەبوون، واتە تەواوی بێ باوەران و فاسیدان زاڵدەبوون بەسەر تەواوی ئایینە ئاسمانییەکاندا و گشت پەرستگاکانیان وێران دەکرد، وە بێ گومان خوای گەورە یارمەتی ئەو کەسانە دەدات و سەریان دەخات کە یارمەتی ئاینەکەی ئەو بدەن و، هەوڵی سەرخستنی بدەن، بە جەنگ و جیهاد کردن، حیکمەتی کارەکانی خوای گەورەش وایە یارمەتی خۆ لاواز کەرو سست و تەمەڵەکان نادات، بەڵکو تەنها یارمەتی ئەهلی گۆرەپان و شەڕ کەران ئەدات، بەراستی خوا خۆی زۆر بەهێزو دەسەڵاتە.

ئەم یاسا خواییە (رەبانییە) کە پێی دەوترێت (دەفع) یان بە جۆرێکی تر بڵێین جەنگ و جیهاد، لاپەرەی زۆری لە پەرتوکەکەی خوای گەورە (قورئان) داگیر کردووە، چونکە دەبێت ئیلا هێز و قوەتێك هەبێت ئەم حەقە هەڵبگرێت، ئایا نەمان بینی چەند حەق هەبوو کە بەهۆی خوزلان و پشت تێکردن و هەوڵ نەدان بۆی بوو بە ژێر پێوە، وە چەند ناحەق و باطل بەرز بوونەوە بەهۆی ئەوەی شوێن کەوتوان و پیاوانێك خۆیان کردە فیدای لە پێناویدا و تەضحي یەیان بۆدا .

**جەنگ و جیهاد لەسەر دوو بنەمای بنەرەتی و ئەساسی بنیات نراوە:**

١) **صەبر و ئارامگرتن** : کە ئازایەتی دڵ و دەروون (الجنان) دەردەخات.

٢) **دەست گوشادی و میهرەبانی، کە پێی دەڵێن (کەرەم)** : کە ئەویش بریتیە لە خستنە گەڕو بەکارهێنانی ماڵ و گیان، بۆیە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی (ئەحمەد) ریوایەتی دەکات، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((الإيمان الصبر والسماحة))**. وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: **((أفضل الإيمان الصبر والسماحة))**.[٦] واتە باشترین و ئەفزەڵ ترینی ئیمان بریتیە لە خۆراگرتن (صەبر) و پیاوەتی، یان جوانمەردی.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمه الله) دەفەرموێت:

((ولما كان صلاح بني آدم لا يتم في دينهم ودنياهم إلا بالشجاعة والكرم بين الله سبحانه أن من تولى عن الجهاد بنفسه أبدل الله به من يقوم بذلك ﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْئًا ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (التوبة ٣٩).[٧] واتە: لەبەر ئەوەی صەلاح و چاکی بەندە لە دونیاو دوا ڕۆژدا بەبێ ئازایەتی و جوامێری نەبێت نایەتەدی، ئەوە خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە بۆمان و ئاگاداری کردوین کە هەرکەس پشت بکات لە جەنگ و جیهاد بە گیانی خۆی، ئەوە خوای گەورە کەسێکی تر دەکاتە جێگەی لە جێی ئەو، هەتا هەستێت بەو کارە، خوای گەورە دەفەرموێت: ((ئەگەر ئێوە هەمووتان بە جارێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا بەرەو مەیدانی جەنگ و جیهاد دەرنەچن، خوای گەورە عەزاب و سزایەکی بەئێشتان ئەداو، دوژمنیش زاڵ ئەکات

---

[٦] ) صحيح: رواه احمد في المسند برقم (١٩٠٠٣) و في كتاب (الزهد) و رواه حافظ ابن حجر العسقلاني في (المطالب العالية) برقم و رواه ابن ابي شيبة في المصنف و ابن ابي شيبة في (المسند) والبيهقي في (الشعب الايمان) والطبراني في (مكارم الاخلاق) عن طريق عمير بن قتادة و جابر بن عبدالله و عمر بن عبس، وصححه الالباني في السلسلة الصحيحة برقم (٥٥٤) و (٤٨٢) و صحيح الجامع الصغير و مشكاة المصباح و قال حديث صحيح .

[٧] ) مجموعة الفتاوى لشيخ الاسلام ابن تيمية رحمه الله (ج٢٨/ ص ١٥٧).

بەسەرتاندا، پاشان ئێوە لادەباو خەڵکانێکی تر دەکاتە جێگاتان، پاشان ئەوان وەکو ئێوە نابن و بەرگری دەکەن لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و وەلآمی دەدەنەوە و دەچن بە دەمیەوە بۆ جەنگ و جیهاد، خۆ بە دانیشتن و دوا کەوتنتان لە جیهاد هیچ زیانێك لەم ئاینە ناکەوێت، یان ناتوانن بە هیچ جۆرێك هیچ جۆرە زیانێکی پێ بگەیەنن، وە خوای گەورەش بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە)).[٨]

بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی کردووە بە شەڕو خراپەی ئەو سیفەتانە، ئەویش بریتین لە چروکی و ترسنۆکی (البخل والجبن)، کە دەبنە مایە و هۆکاری خراپ کردن و فاسید کردنی نەفسی مرۆڤ و ڕووخاندن و تێکدانی کۆمەڵگاکان، وە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا کە ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **((شر ما في رجل شح هالع و جبن خالع))**.[٩] واتە: خراپترین شەڕێك کە لە پیاودا هەبێت بریتیە لە: دونیا خۆشەویستێکی بەرچاو و دڵ تەنگ و خەفەتبار، لەگەڵ ترسنۆکێکی بێ دڵ و ئیرادە و ڕوخاو.

ڕۆژانێك ڕۆشت و تێپەڕی بەسەر (سەلەف) پێشینی صالحدا، کە بەم بەرنامە (دەفع) کاریان کردوو بونە سادە و پێشەوای دونیا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة: ٢٤) واتە: چەند کەسێکمان لێ کردنە سەرکردە و پێشەوا، چونکە لە ئایندەدا بە فەرمانی خۆمان

[٨] ) ئەم ئایەتە لەسەر ئەوانە دابەزی کە دواکەوتن لە جەنگی تەبوك.

[٩] ) صحيح: رواه احمد في المسند برقم (٧٨٠٣) و ابو داود و ابن حبان و ابن ابي شيبة وابن المبارك في كتاب (الجهاد) و صححه الالبانى رحمه الله في سنن ابي داود و صحيح الجامع الصغير للسيوطي، و صحيح الترغيب والترهيب للمنذري و قال حديث صحيح .

ڕێنمویی خەڵکیان دەکرد و صەبر و ئارامیان گرت و، دانیان بەسەر هەموو نارەحەتی و ئازارەکاندا گرت کە هاتە ڕێیان، وە یەقینیشیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو.[١٠]

وەك عبدالله ی کوری عەمرو خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتاری بۆ ئەداین و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد و دەیفەرموو: ((**صلاح أول هذه الأمة بالزهد واليقين و يهلك آخرها بالبخل والأمل**)).[١١] واتە: ڕزگار بوون و چاکی یەکەمی ئەم ئوممەتە بە زوهد و یەقینە، و کۆتاییەکەشی بە ڕەزیلی و دونیا خۆشەویستی و هیوای زۆر بە دونیا، تیا دەچێت و بەهەلاك دەچێت.[١٢]

پاش ئەوەی خۆشەویستی دونیا لەناو موسوڵماناندا سەری دەرکرد و باڵی کێشا و، بەرنامە و قەوانینەکانی خوای گەورە پشت گوێ خراو لەبیر کرا، حوکمەکانی خوای گەورە لەکار خراو فەوتان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴾ (مريم: ٥٩) واتە: لەدوای ئەو پێغەمبەرانە کۆمەڵێك لە کەسانی خراپ و لاسار بوونە جێگریان، ئەمانیش یەهودی یەکان بوون، وازیان لە نوێژ هێناو بێ باوەر بوون بە خوای گەورە، وە شوێن هەواو هەوەس و ئارەزوو کەوتن، ئەوانە تووشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن.

واتە کارە خراپەکانیان بۆ جوان و ڕازابووە و شوێن شەهوەت و هەواو هەوەسی خۆیان کەوتبوون، وە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله

---

[١٠]) ئەم ئایەتە لەسەر هەندێك لە خوا ترسەکانی بەنو ئیسرائیل دابەزی کە خوای گەورە باسی چاکە و بروا کردنیان بە پێغەمبەرێتی محمد (صلى الله عليه وسلم) دەکات (ابن عەباس).

[١١]) صحيح: رواه احمد في الزهد برقم (٥٢) و السيوطي في صحيح الجامع الصغير والطبراني والبيهقي، و صححه الالباني في صحيح الجامع الصغير برقم (٣٧٣٩) .

[١٢]) ئیمامی مەناوی رەحمەتی خوای لێ بێت لەسەر فەرموودەکە لە فيض القدير (٤/ ٣٠١)دا دەفەرموێت: ((والمراد غلبة البخل والأمل في آخر الزمان يكون من الأسباب المؤدية للهلاك؛ بكثرة الجمع، والحرص، وحب الاستئثار بالمال المؤدي إلى الفتن والحروب والقتل وغير ذلك ذكره بعضهم)).

علیه وسلم) فەرموویەتی: **((إن الله يبغض كل جعظري جواظ، سخاب في الاسواق، جيفة بالليل حمار بالنهار، عالم بالدنيا جاهل بالآخرة)).**[١٣] واتە: خوای گەورە رِقی لە هەموو ئەدەب ناشرینێكی خۆ بەزل زانو، رەزیل و چروكێكی دەست قونجاو دەبێتەوە، كە بەردەوام لە ناو بازاڕەكاندا خەریكی چەنە بازی و هاوار هاوارە، شەو یان دەبێتەوە وەك لاكە تۆپیو یان وەك گا، وە رِۆژیش وەكو كەر، زانایە بە كارو باری دونیا، نەزان و جاهیلە بە دوارِۆژ.

لە گەورەترین و گرنگترین ئەو فەریزە نادیارەو واجبە لەبیر كراوانە، فەریزەی جەنگ و جیهاد كردنە، كە ئێستا لە واقیعی موسولمانانیدا نەماوە و وون بووە، وە لە ئەنجامی ئەمەش (وازهێنان و تەرك كردنی جەنگ و جیهاد) بوونەتە كەفی سەر دەریا، وەك لە فەرموودەكەدا هاتووە (غثاء السيل)، ئەوبان لە پێغەمبەری خوداوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرِێتەوە فەرموویەتی: **((يوشك أن تداعى عليكم الأمم كما تداعى الأكلة إلى قصعتها فقال قائل: ومن قلة نحن يومئذ؟ قال بل أنتم يومئذ كثير ولكنكم غثاء كغثاء السيل ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم وليقذفن الله في قلوبكم الوهن فقال قائل: يا رسول الله وما الوهن؟ قال حب الدنيا وكراهية القتال أو الموت)).**[١٤] واتە: زەمانێك دێت بەسەرتاندا، یان خەریكە دێت بەسەرتاندا، كە ئوممەتانی دیكە زاڵ دەبن بەسەرتاندا، وەك چۆن گەلە سەگ زاڵ دەبن بەسەر سەرە مەرِدا، یەكێك پرسی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە لەبەر كەمی مانە لەو رِۆژەدا؟ فەرمووی: ئێوە ئەو رِۆژە زۆرن، وەك زۆری كەفی سەر دەریا، وە خوای گەورە هەیبەت و سامی ئێوە لە دڵی دوژمنەكانتاندا دەردەهێنێت و وەهن

---

[١٣]) صحيح: رواه احمد في المسند و ابن حبان في صحيحه و الحاكم في المستدرك والسنن الكبرى للبيهقي، و صحيح الجامع الصغير للسيوطي (١٨٧٤) وصححه الالبانى رحمه الله في صحيح الجامع الصغير / جعظري: فض غليظ مستكبر، جواظ: جماع مناع، سخاب: ثرثار، زۆر بلی و چەنە باس .

[١٤]) صحيح: رواه امام احمد في مسند (الانصار) برقم (٢١٨٠٣) و ابن ابي شيبة في (المصنف) و الطيالسي في (مسنده) و شعب الايمان للبيهقي، و مسند الشاميين للطبراني، وابو داود في سننه كتاب الملاحم برقم (٤٢٩٧) ، وصححه الالبانى رحمه الله في السلسلة الصحيحة برقم (٩٥٨) و سنن ابي داود و مشكاة المصباح (٥٣٦٩) و صحيح الجامع الصغير للسيوطي برقم (٨١٨٣). وقال الالبانى حديث صحيح .

دەکاتــە دڵتانــەوە، کەسـێك پرسـی وەهـن چـییە ئـەی پێغەمبــەری خــوا؟ فــەرمووی: خۆشەویستی دونیاو پشت هەڵکردن یان ڕق لێبونەوە لە شەڕ یان مردن.

## وجهاد الكفار نوعان

## تێکۆشان و جیهاد کردن دژی بێ باوەڕان (کوفار) دوو جۆرە

١) **جهاد الطلب**: کە پێی دەوترێت جیهادی دەست پێشخەری و داوا کردن و خواستن بـە نیازی بەدەست هێنانی مەبەست و ویستێك، وەك پێی دەڵێن هێرش بەری: ئەویش بـە جـەنگ و جیهاد کردن دژی کافر و بێ باوەڕان لە خاك و ئەرزی خۆیاندا، (طلب الكفـار في بلادهـم) بـەو جۆرەی بێ باوەڕان لە بارو دۆخێکدا بن کە پەرتەوازەبن و خۆیان ئامادە نەکردبێت بۆ جەنگ و کوشتار کردن لەدژ موسوڵمانان، ئا لەم کاتەدا جەنگ و جیهـاد فـەرزی کیفایەتـە، کـەمترین فەرزی کیفایەتیش لابردنی مەترسییە لەسـەر موسـوڵمانان، ئـەویش بـە تـرس خـستنە دڵـی و تۆقاندنی دوژمنانی خوای گەورە، وە ناردن و ڕەوانە کردنی هێزو سوپا هەموو سـەری سـاڵێك بەلایەنی کەمی یەوە، پێویستە لەسەر ئیمام و پێشەوای موسوڵمانان کە هێـزو سـوپا و سریە بنێرێـت بـۆ (دار الحـرب) خـاکی جـەنگ و کوشـتار، هـەموو سـاڵێك جارێـك یـان دووجـار، وە پێویستە لەسەر ڕەعیە و ژێر دەستەکانیش کە گوێڕایەڵی و ئیطاعەی بکەن، خۆ ئەگەر ئیمـام کەم تەرخەمی کردوو هەڵنەستا بەم کارە، ئەوە تاوان باردەبێت، واتە ئیمام دەبێتە ئیمامێکی تاوانبار و یاخی لە فەرمان و داوا کارییەنی شەرع.[١٥] زاناو فوقەهاکان ئـەم حـوکم و بڕیارەیـان قورستر کردووە لەسەر پێدانی (جزیە)، هەر بۆیە ئوصولیەکان دەڵێن:

((الجهاد دعـوة قهريـة، فتجـب إقامتـه بقـدر الإمكـان حتـى لا يبقـى في الأرض إلا مـسلم أو مسالم)).[١٦] واتـە: جیهادو تێکۆشان بانگەوازێکی ئیجباری یە، واجبە بانگەوازی بۆ بکرێت و

---

[١٥] ) حاشية ابن عابدين (١٣٨/٣).

[١٦] ) حاشية الشرواني وابن قاسم على تحفة المحتاج على المنهاج (٢١٣/٩).

جێبەجێ بکرێت بە پێی توانا، هەتا کەسێك نەمێنێتەوە لەسەر ڕووی زەویدا ئیلا موسوڵمان یان (موسالیم) جزیە دەر بێت.

**٢) جهاد الدفع:** ئەم جۆرەیان پێی دەڵێن جەنگ و جیهادی بەرگری و دوورخستنەوە: ئەویش بە ڕوو بەڕو بوونەوەی کافران و بێ باوەران لە ئەرز و خاکی خۆماندا (واتە خاکی موسوڵمانان)، کە ئەمەشیان دەبێتە فەرزی عەین، بەڵکو گەورەترین و گرنگترین فەرزی سەرشانە، وە ئەم حوکمەش لە چەند کات و حاڵەتێکدا دەچەسپێت و دیاری دەکرێت :

**أ) إذا دخل الکفار بلدة من بلاد المسلمین:** واتە ئەگەر بێ باوەران چوونە ناو خاك و ئەرزێك لە خاکی موسوڵمانان .

**ب) إذا التقی الصفان و تقابل الزحفان:** ئەگەر هەردوو ڕیز (صەف) ی موسوڵمانان و بێ باوەران بەیەك گەیشتن و تێك ڕژان و (زەحف) یان بەرە و ڕووی یەك کرد، یان ڕوو بەیەك

**ج) إذا استنفر الإمام أفراد أو قوما وجب علیهم النفیر:** ئەگەر پێشەواو ئیمامی موسوڵمانان نەفیرو دەرچوونی بەرەو بەرەکانی جەنگ و جیهادی ڕاگەیاند، بەسەر کەسانێکدا یان تاقمێك یان گەلێکدا، ئەوە ڕۆشتن و دەرچوون بۆ جەنگ و جیهاد واجب دەبێت لەسەر یان .

**د) إذا أسر الکفار مجموعة من المسلمین:** ئەگەر بێ باوەران کۆمەڵێك لە موسوڵمانانیان بە دیل (ئەسیر) گرت .

الحالة الأولى: دخول الكفار بلدة من بلاد المسلمين:

## حاڵەتی یەکەم:

# داگیر کردن و چوونە ناو خاکێك لە خاکی موسوڵمانان لە لایان بێ باوەڕانەوە

لەم کاتەدا، تێکرای سەلەف و خەلەف و زانا و فوقەهاکانی هەر چوار مەزهەبەکە و فەرمووده ناسان (محدثین) و موفەسرین و تەواو و تێکرای زانایانی هەموو چاخەکانی ئیسلامی پێکەوە، موتەفیق و کۆراو یەك دەنگن، لەسەر ئەوەی کە لەم کاتەدا جەنگ و جیهاد کردن فەڕزی عەینە، واتە فەرزی سەر شانە، لەسەر تێکراو تەواوی دانیشتوان و ئەهلی ئەو خاك و شار و ولآتە ـ کە بێ باوەڕان هێرشیان بۆ بردووە ـ وە لەسەر هەموو ئەوانەش کە لەو خاك و ولآتەوە نزیکن، هەتا بەو جۆرەی کوڕ بەبێ پرس و ڕووخسەتی باوکی و ئافرەت بەبێ پرس و ڕووخسەتی هاوسەرەکەی و قەرزدار بەبێ پرس و ڕوخسەتی خاوەن قەرز دەچن بەدەم ئەم فەریزە شەرعییەوە، کە ئەویش جەنگ و جیهاد کردنە دژی داگیرکەر و، بەرگری کردنە لەو خاك و ولآتە (خاکی موسوڵمانان)، خۆ ئەگەر تەواوی دانیشتوانی ئەو خاك و ئەرزە کەم بوون و بڕی پێویست نەبوون بۆ ئەو کارە، یان نەیان توانی یان کەم تەرخەم بوون و دانیشتن وپشتیان هەڵکرد لەو کار و فەڕیزە شەرعییە، ئەوە حوکمی فەڕزییەتی جەنگ و جیهاد کردن باڵدەکێشێ و درێژ دەبێتەوە بۆسەر تەواوی ناوچە و شوێنە نزیکەکانی ئەو خاکە داگیر کراوە، خۆ ئەگەر ئەوانیش کەم بوون و بەشی پێویست نەبوون، ئەوە لەسەر ئەوانەی دوای ئەوان و نزیکی ئەوان فەڕز دەبێت، خۆ ئەگەر ئەوانیش نەیان توانی ئەوە لەسەر ئەوانی دوای ئەوان فەرز دەبێت، هەتا بەو جۆرەی لەسەر تەواوی دانیشتوانی زەوی فەرز دەبێت کە بچن بەدەم ئەو فەریزە شەرعییەوە،

ئەویش بریتیە لە بەرگری کردن لە خاکی موسولمانان و ڕوو بەڕو بوونەی دوژمنان و داگیرکەران .

هەر بۆیە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت:

((وأما قتال الدفع فهو أشد أنواع دفع الصائل عن الحرمة والدين واجب إجماعا، فالعدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه، فلا يشترط له شرط – كالزاد والراحلة – بل يدفع بحسب الإمكان، وقد نص على ذلك العلماء أصحابنا وغيرهم)).

واتە: شەڕ و کوشتاری بەرگری و دەفع، لە توند ترین و سەخت ترین جۆرەکانی بەرگری و دوور خستنەوەی دوژمنی (صائیل) خراپە کار و فاسیدە، لە حورمەت و ئاین، کە واجبە بە کۆرا و ئیجماع، چونکە ئەو دوژمنە فاسیدو صائیلەی کە دین و دونیا فاسید دەکات هیچ شتێك واجب ترنییە لە دوای ئیمان لە ڕووبە ڕوو بوونەوەی و دوور خستنەوەی، وە هیچ مەرجێك لە مەرجەکان نەکراوەتە مەرجی ئەو کارە، وەك ئامرازی گواستنەوە و توێشو، بەڵکو بەرگری دەکرێت لە دژی بەو پەڕی هێز و توانا و دەسەڵات، ئەمەش زانایانی هاوەڵمان و غەیری ئەوانیش ئاماژەیان پێداوە و بڕیویانەتەوە.

هەروەها شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) بۆچونی وایە کە ئامرازی گواستنەوە و پەڕینەوە مەرج نییە بۆ ئەو کارە و، پێداگری لەسەر کردووە، ئەمەش لە وەڵام و ڕەدی بۆ (القاضی) کە وتوویەتی: ((إذا تعين فرض الجهاد على أهل بلد فمن شرط وجوبه الزاد والراحلة إذا كانوا على مسافة القصر قياسا على الحج))، بەڵام شێخی ئیسلام وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێت:

((ئەوەی (القاضی) دەیڵێت لە قیاس کردنی جیهاد بە حەج، لە هیچ کەسێکەوە شتی وا نەوتراوە و نەهاتووە، ئەوەش قسەیەکی لاوازە، چونکە واجبی جەنگ و جیهاد بۆ دوورخستنەوە و بەرگری کردن لە دوژمن واجبترە لە هیجرەت و کۆچ کردن، پاشان هیجرەت و کۆچ کردن وا دانانرێت ئامرازی گواستنەوەی تێدا بێت، واتە ئامرازی گواستنەوە مەرج نەکراوە بۆ هیجرەت و کۆچ کردن، هەندێك جەنگ و جیهاد ئەولا ترو لە پێش ترە؛ بە صەحیحی سابت بووە لە

فەرموودەکـەی ئـەبو هـورەیرەوە، ئـەویش لـە پێغەمبـەری خـوداوە (صـلى الله علیـه وسـلم) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((بايعنا رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم علـى الـسمع والطاعـة في العـسر واليسر، والمنشط والمكره، وعلى أثرة علينا، وعلى أن لا ننـازع الأمـر أهلـه، وعلـى أن نقـول بـالحق أينما كنا، لا نخاف في الله لومة لائم)).[17] واتە: ئێمـە بەیعـەت و پـەیمان مانـدا بـە پێغەمبـەری خـوا (صلى الله علیه وسلم) لەسەر گوێڕایەڵی و سەمع و طاعەت، لە خۆشی و ناخۆشیدا، لـەو شـتانەی کە پێمان خۆشە و کە پێمان ناخۆشە و لەسەرمان قورس و گرانە، و لەسەر هـەموو ئـەو شـتانەی کە بە تایبەت دەدرێت بەسەرماندا، هەروەها دووبەرەکی و نیزاع دروست نەکـەین لەگـەڵ خـاوەن بڕیارەکان، هەروەها لە هەر شوێنێك بووین تەنها هەق بڵێین، لەسـەر فـەرمانی خـوای گـەورە لـە لۆمەی هیچ کەسێك نەترسین، وە واجب ترین گوێڕایەڵ و ئیطاعەت کۆڵەکەکەی بریتیە لە ڕۆشـتن و بەدەمـەوە چـوون (الاسـتنفار) لـە خۆشـی و ناخۆشـیدا، لێـرەدا (جیهـادی بـەرگری) لەگـەڵ نارەحەتی و عوسریدا واجبە بە پێچەوانەی حەج کردنەوە، ئەمەش بۆ جەنگ و جیهـادی (الطلـب) خواستن، بەڵام جەنگ و جیهادی بەرگری (دەفع) ئەوەیان توند ترین و سـەخت تـرین جۆرەکـانی دوور خستنەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی صائیلە لە حورمەت و دین، کە بـە کـۆڕا و ئیجمـاع واجبـە، چونکە دوژمنی خراپە کارو فاسد (صائیل) کە دین و دونیا فاسیدەکات، هیچ شـتێك نییـە واجـب تر نییە لە پاش ئیمان لە دوورخستنەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی و دەفع کردنی)).[18]

---

[17] ) صحيح : رواه مسلم – كتاب الإمارة باب وجوب طاعة الأمراء في غير معصية – برقم : (٣٥١٥).

[18] ) من كتاب الاختيارات العلمية لابن تيمية ملحق بالفتوى الكبرى (٤/ ٦٠٨).

تەواوی فەتواکە بە زووبانی عەرەبی بەم جۆرەیە :

((وما قاله القاضي من القياس على الحج لم ي نقل عن أحد وهو ضعيف، فإن وجـوب الجهـاد يكـون لـدفع ضـرر العـدو فيكون أوجب من الهجرة، ثم الهجرة لا تعتبر فيها الراحلة، فبعض الجهاد أولى، وثبت في الصحيح مـن حـديث عبـادة بـن الصامت عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: على المرء المسلم السمع والطاعة في عسره ويـسره ومنـشطه ومكرهـه وأثرة عليه فأوجب الطاعة عمادها الإستنفار في العسر واليسر، وهنا نـص في وجوبـه مـع الإعـسار بخـلاف الحـج، هـذا في قتال الطلب، وأما قتال الدفع فهو أشد أنواع دفع الصائل عن الحرمة والدين واجب إجماعا، فالعدو الصائل الـذي يفـسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه)).

## نصوص مذاهب الفقهاء الأربعة التي تجمع على هذه القضية:

# دەقی زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە لەسەر ئەم باسە پێکهاتوون و کۆران:

**یەکەم: فوقەهاء و زانایانی حەنەفی:**

ئیبن عابدین لە (حاشیەی ئیبن عابدین) دا دەفەرموێت:

((وفرض عين إن هجم العدو على ثغر من ثغور الإسلام فيصير فرض عين على من قرب منه، فأما من وراءهم ببعد من العدو فهو فرض كفاية إذا لم يحتج إليهم، فإن احتيج إليهم بأن عجز من كان بقرب العدو عن المقاومة مع العدو أو لم يعجزوا عنها ولكنهم تكاسلوا ولم يجاهدوا فإنه يفترض على من يليهم فرض عين كالصلاة والصوم لا يسعهم تركه، وثم وثم إلى أن يفترض على جميع أهل الإسلام شرقا وغربا على هذا التدريج)) .

واتە: جەنگ و جیهاد کاتێك دەبێتە فەرزی عەین ئەگەر دوژمن هێرشی بردە سەر خاکێك لە خاکەکانی ئیسلام، لەم کاتەدا جەنگ و جیهاد فەرز دەبێت لەسەر هەموو ئەوانەی لەو خاکەوە نزیکن، بەڵام ئەوانەی لە دوایانەوەن بە دووری لە دوژمنەوە، ئەوە جەنگ و جیهاد لەسەر ئەوان فەرزی کیفایەتە، ئەویش بەو مەرجەی خەڵکان و دانیشتوانی ئەو خاکە پێویستی یان بەوان نەبێت، کە لەو دیو ئەوانەوەن، خۆ ئەگەر ئیحتیاج و پێویستی یان پێیان هەبوو، بەوەی ئەوانەی لە دووژمنەوە نزیکن توانای مقاوەمە و بەرگری و ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمنیان نەبێت، یان توانایان هەبێت بەڵام تاقەتیان نەبێت و خەم سارد بن و پشت هەڵکەن لە بەرگری و شەڕ کردن، و جەنگ و جیهاد نەکەن، ئەوە ئەو کاتە جەنگ و جیهاد فەرز دەبێت لەسەر هەموو ئەوانەی دوای ئەوان، فەرزی عەین، وەك نوێژ و ڕۆژوو، وە هیچ شتێك نابێتە بەهانە بۆ نەکردنی و تەرك کردنی، وە پاشان وە

پاشـان، بـەو جـۆرە هـەتا فـەرز دەبێـت لەسـەر هـەموو ئـەهل و دانیـشتوانی ئیـسلام، لـە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاوا، لەسەر ئەم پلە و قۆناغە.[١٩]

بەهەمان جۆر و شێواز هەر سێ زانایان لـە شـوێن کـەوتوانی حەنـەفی فـەتوایان داوە، ئەوانیش:

١) ئیمامی کەسانی (الکسانی) لە پەرتوکی (بدائع الصنائع) / (٧٢/٧)،

٢) ئیمامی ئیبن نەجیم لە پەرتوکی (البحر الرائق) / (١٩١/٥).

٣) وە ئیمامی ئیبن هەمام لە پەرتوکی (فتح القدیر) / (١٩١/٥).

### دووەم: لەلای فوقەهاء و زانایانی شوێنکەوتەی مالیکی:

لە حاشیەی دەسوقی (الدسوقی) دا هاتووە دەفەرموێت: ((ویتعین الجهاد بفجء العدو)، قال الدسوقي: (أي توجه الدفع بفجئ) مفاجـأة) علـى كـل أحـد وإن امـرأة أو عبـدا أو صـبيا، ويخرجون ولـو مـنعهم الـولي والـزوج ورب الـدين)). واتـە: جـەنگ و جیهـاد کـردن بـە هـاتنی کتوپڕی دوژمن واجب دەبێت، وە ئیمامی دەسوقی ڕەحمەتی دەفەرموێت: واتە بـە هـاتنی دوژمن بە کتوپڕی و فوجئەت، موفاجەئـە، لەسـەر هـەموو کەسـێك واجـب دەبێـت، ئەگـەر ئافرەت یان کۆیلە یان منداڵ بێت، وە دەچن بەدەم ئەو جەنگ و جیهادەوە، ئەگەر وەلی و هاوسەر و خاوەن قەرز ڕێگریشیان لێ بکەن، واتە گوێڕایەڵی نـاکرێن ئەگـەر ڕێگـری چـونە جیهادیان کرد.[٢٠]

### سێهەم: لەلای فوقەهاءو زانایانی شوێنکەوتەی شافعی:

لـە (نهایـە المحتـاج) دا کـە دانـراوی شـێخی گـەورەمان ئیمـامی (ڕەملـی) یـە هـاتووە دەفەرموێت: ((فإن دخلوا بلدة لنا وصار بيننا وبينهم دون مـسافة القـصر فيلـزم أهلـها الـدفع

---

[١٩]) حاشية ابن عابدين (٢٣٨/٣).

[٢٠]) حاشية الدسوقي (١٧٤/٢).

حتى من لا جهاد عليهم، من فقير وولد وعبد ومدين وامرأة)) ئەگەر داگیر کەران هاتن بۆ سەر خاکی ئێمە و ، هاتنە ناوی، وە لە نێوان ئێمە و ئەواندا هیچ ماوەیەکی کورت نەبوو، ئەوە بەرگری و ڕوو بەڕوو بونەوە لەسەر دانیشتوان و ئەهلی ئەو خاکە واجب دەبێت، هەتا لەسەر ئەوانەش کە جەنگ و جیهادیان لەسەر نییە، لە هەژار و منداڵ و بەندە و قەرزدار و ئافرەت.[٢١]

## چوارەم: لەلای فوقەهاء و زانایانی شوێن کەوتەی حەنبەلی:

لە پەرتوکی (المغنی) دا کە دانراوی شێخی فەقیهو شارەزای حەنبەلی (ئیبن قودامەی مەقدسی)یە هاتووە دەفەرموێت: (ويتعين الجهاد في ثلاثة مواضع:

١) إذا التقى الزحفان وتقابل الصفان.

٢) إذا نزل الكفار ببلد تعين على أهله قتالهم ودفعهم.

٣) إذا استنفر الإمام قوما لزمهم النفير).

واتە: جیهاد کردن لە سێ (٣) کاتدا دادەمەزرێت (فەرز) دەبێت:

١) ئەگەر هەردوو ڕیزی موسوڵمانان و بێ باوەران بەیەك گەیشتن و تێکرژان و زەحف یان کرد ڕوو بەیەك .

٢) ئەگەر بێ باوەڕان چونە ناو وڵاتێك یان خاکێك لە خاکی موسوڵمانان، ئەو کاتە شەڕ و کوشتار و ڕووبە ڕوو بونەوەی ئەو داگیر کەرە لەسەر تەواوی دانیشتوانی ئەو خاکە فەرز دەبێت.

٣) ئەگەر (ئیمام) پێشەوا نەفیر و فەرمانی بە دەرچوون و ڕاپەرینی گەلێك کرد، ئەوە فەرز دەبێت لەسەر یان کە بچن بەدەم نەفیر و فەرمانی ئەمیرەکەیانەوە.[٢٢]

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت:

---

[٢١]) نهاية المحتاج (٥٨/٨).

[٢٢]) كتاب المغني لابن قدامة المقدسي (٣٤٥/٨).

((إذا دخل العدو بلاد الإسلام فلا ريب أنه يجب دفعه على الأقرب فالأقرب، إذ بلاد الإسـلام كلها بمنزلة البلدة الواحدة، وأنه يجب النفير إليه بلا إذن والد ولا غريم، ونصوص أحمد صريحة بهذا)).[٢٣]

واتە: ئەگەر دوژمن هاتە ناو خاکی ئیسلامەوە، ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە، کە ڕووبەڕوو بونەوە و وەستانەوە (دەفع) دژی واجبە لەسەر نزیکترین نزیك لەو خاکەوە، چونکە خاکی ئیسلام هەمووی لەسەر پلەو مەنزیلەی یەك خاك و نیشتمانە، وە چوون و بەدەمەوە چوون و ڕاپەڕینی (نەفیر) واجبە بەبێ پرس و ڕوخسەتی باوك و دایك و خاوەن قەرز بۆ کەسی قەرزدار، وە وتەو نصوصی ئیمام ئەحمەد لەم بارەوە ڕوون و ئاشکرایە.

ئەم حاڵەتە بە دەرچوون و ڕاپەڕینی گشتی (نفیر العام) ناسراوە .

## أدلة النفير العام و مبرراته :

## بەڵگەو هۆکارەکانی دەرچوون و ڕاپەڕینی گشتی (نفیر العام) :

١) خوای گەورە (عزوجل) دەفەرموێت: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ (التوبة: ٤١).

واتە: هەمووتان پێکەوە (پیر و گەنج، ئازا و ترسنۆك، دەوڵەمەند و هەژار) بەماڵ و سامان، بە دڵ و بە گیان، لە ڕێی خودا دەربچن و جیهاد بکەن، ئەوە خێرترە بۆ تان (جیهاد) کردن لە دانیشتن و مانەوەتان، ئەگەر بزانن و تێ بگەن.[٢٤]

---

[٢٣]) مجموعة الفتاوى الكبرى (٦٠٨/٤).

[٢٤]) ئەم ئایەتە ساڵی ڕووداوەکەی جەنگی تەبوك نازڵ بوو، خوای گەورە فەرمانی دا بە گشت موسوڵمانان کە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەڕێ بکەون و بچنە غەزا دژی سوپای ڕۆمەکان، ئەم فەرمانەش فەرمانێکی براوە و حەتمی بوو، خۆلادان و پێچ و پەنا نەبوو لێی ...

پێش ئەم ئایەتە لە ئایەتی (٣٩) دا خوای گەورە بەڵێنی بە سزا و عەزاب و گۆڕینی کەسانێك بە کەسانێکی تر لە جێگەی ئەوان داوە بەو کەسانەی کە تەرکی جەنگ و جیهاد کردن دەکەن، وە ئاشکراشە هیچ کات سزا و عەزاب باسناکرێت مەگەر لەبەر تەرك کردن و پیشت گوێ خستنی واجبێك نەبێت یان لەبەر ئەنجام دانی کارێکی حەرام و خراپ نەبێت، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـًٔاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ (التوبة: ٣٩) واتە: ئەگەر ئێوە هەمووتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا بە جارێك بەرەو مەیدانی جەنگ و جیهاد دەرنەچن، ئەوە خوای گەورە عەزاب و سزایەکی بەئێشتان ئەداو، دوژمنیش زاڵ ئەکات بەسەرتاندا، پاشان ئێوە لادەباو خەڵکانێکی تر دەکاتە جێگاتان، پاشان ئەوان وەکو ئێوە نابن و بەرگری دەکەن لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وەڵامی دەدەنەوە و دەچن بە دەمیەوە بۆ جەنگ و جیهاد، خۆ بە دانیشتن و دوا کەوتنتان لە جیهاد هیچ زیانێك لەم ئاینە ناکەوێت، یان ناتوانن بە هیچ جۆرێك هیچ جۆرە زیانێکی پێ بگەیەنن، وە خوای گەورەش بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.[٢٥]

ئیبن کەثیری موفەسیر (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت:

((أمر الله تعالى بالنفير العام مع رسول الله صلى الله عليه وسلم عام غزوة تبوك لقتال أعداء الله من الروم الكفرة من أهل الكتاب، وقد بوب البخاري (باب وجوب النفير وما يجب من الجهاد والنية) ، وأورد هذه الآية، وكان النفير العام بسبب أنه ترامي إلى أسماع المسلمين أن الروم يتعدون على تخوم الجزيرة لغزو المدينة، فكيف إذا دخل الكفار بلد المسلمين، أفلا يكون النفير أولى؟ قال أبو طلحة رضي الله عنه في معنى قوله تعالى (خفافا وثقالا) كهولا وشبابا ما سمع الله عذر أحد)).

---

[٢٥]) ئەم ئایەتە لەسەر ئەوانە دابەزی کە دواکەوتن لە جەنگی تەبوك.

واتە: خوای گەورە فەرمان دەکات بە دەرچوون و راپەرینی هەمووان، واتە دەرچوونی هەموو هاوەڵان لەگەل پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ساڵی جەنگی (تەبوك) بۆ شەڕ و کوشتاری دوژمنانی خوا، لە ڕۆمە بێ باوەڕەکان کە لە ئەهلی کیتاب بوون، وە ئیمام بوخاری لە (صەحیح)ەکەیدا (باب)ێکی داناوە بەناوی : (النفير وما يجب من الجهاد والنية)، وە ئەم ئایەتەی هێناوە بە بەڵگە، وە نەفیر و راپەرینی هەموانیش بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەنگۆی ئەوە هەبوو لەناو موسوڵماناندا کە ڕۆمەکان هێرش دەکەنە سەر (جەزیرە) نیمچە دوورگەی عەرەبی بۆ داگیر کردنی شاری (مەدینە)، ئەی چی بەوەی ئەگەر بێ باوەران بچنە ناو خاکی موسوڵمانان؟ ئایا راپەڕین و نەفیر لە پێشتر و گەورەتر نییە؟ ئەبو طەلحە خوای لێ ڕازی بێت لە واتای وتەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿خفافا و ثقالا﴾ دەفەرموێت: واتە پیر و گەنج، وە خوای گەورە گوێ ناگرێت لە بەهانەی هیچ کەسێك.[٢٦]

ئیمامی حەسەنی بەصری رەحمەتیش دەفەرموێت: ﴿خفافا و ثقالا﴾ أي (في العسر واليسر). واتە لە خۆشی و ناخۆشیدا.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە (مجموع الفتاوى) دا دەفەرموێت:

((فأما إذا أراد العدو الهجوم على المسلمين فإنه يصير دفعه واجبا على المقصودين كلهم وعلى غير المقصودين، كما قال تعالى (وإن استنصروكم في الدين فعليكم النصر)، كما أمر النبي صلى الله عليه وسلم بنصر المسلم، وسواء كان الرجل من المرتزقة للقتال أو لم يكن، وهذا يجب بحسب الإمكان على كل أحد بنفسه وماله مع القلة والكثرة والمشي والركوب، كما كان المسلمون لما قصدهم العدو عام الخندق لم يأذن الله في تركه لأحد)).

واتە: ئەگەر دوژمن ویستی وابوو کە هێرش بکاتە سەر موسوڵمانان، ئەوە ئەو کاتە ڕووبەڕوو بونەوەی (دەفعی) واجب دەبێت لەسەر هەموو ئەوانەی کە دوژمن نیازی هێرش کردنە سەریانی هەیە، وە لەسەر هەموو ئەوانەش کە نیازی نییە یان مەبەستی نییە هێرش

---

[٢٦]) مختصر تفسير ابن كثير رحمه الله (١٤٤/٢).

بکاتە سەریان، واتە ئەوانەی مەبەستی دوژمنن و ئەوانەش کە مەبەستی نین، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ((خۆ ئەگەر داوای یارمەتییان لێ کردن و ئیستیعانەیان پێ کردن (برا موسوڵمانەکانتان) بۆ سەرخستن و پاراستنی ئایینەکەیان، دەبێت ئێوەش یارمەتییان بدەن و سەریان بخەن بەسەر دوژمنانی هەردوولاتاندا)). هەروەها چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی داوە بە نوصرەت و سەرخستنی موسوڵمانان، جا ئەگەر پیاوێکی شەڕکەر بێت لە (مورتەزیق)ەکان، یان وانەبێت، وە ئەمەش واجب دەبێت بە پێی هەموو توانایەك لەسەر هەموو کەسێك بە گیان و ماڵی، لەگەڵ زۆری و کەمی ڕۆشتن و سوار بوون، واتە ئەوانەی بە پیادە دەڕۆن وە ئەوانەش کە بە سواری ولاخ و وشتر دەڕۆن، وەك چۆن موسوڵمانان کاتێك دوژمنان ساڵی (خەندەق) ویستیان هێرش بکەنە سەریان و کردنیاننە ئامانج، خوای گەورە ئیزن و ڕوخسەتی هیچ کەسێکی نەدا بۆ واز هێنان لە جیهاد کردن و ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمنان.[٢٧]

هەروەها ئیمامی زوهری (الزهری) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت:

((خرج سعيد بن المسيب إلى الغزو وقد ذهبت إحدى عينيه فقيل له: إنك عليل فقال: استنفر الله الخفيف والثقيل فإن لم يمكني الحرب كثرت السواد وحفظت المتاع)).[٢٨]

واتە: سەعیدی کوری موسەیب چوو بۆ غەزایەك، لەهەمان کاتدا یەکێك لە چاوەکانی کوێر بوو، واتە چاوێکی نەی دەبینی، پێیان ووت: تۆ چاوت تەواو نییە و نەخۆشی، ئەویش فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی دەرچوون و ڕاپەرینی کردووە بە سوك و قورس، خۆ ئەگەر من توانای شەرو کوشتاریشم نەبێت، هیچ نەبێت ڕەشایی سوپای موسوڵمانانم زیاد کردووە، و پێداویستی یەکانیشم پاراستووە.

---

[٢٧]) مجموعة الفتاوى لشيخ الاسلام ابن تيمية (٢٨/٣٥٨) كتاب الجهاد .

[٢٨]) الجامع لأحكام القران (٨/١٥٠) للقرطبي .

٢) خوای گەورە (عز وجل) دەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ (التوبة ٣٦). واتە: دژی هەموو موشریکەکان شەڕ و کوشتار بکەن لە هەموو مانگەکاندا (بەحەلاڵ و حەرامەوە) وەك چۆن ئەوان شەڕ و کوشتارتان دەکەن.

ئیمامی (ابن العربی) دەفەرموێت: ((کافة یعنی محیطین بهم من کل جانب وحالة)). هەمووی (کافة) واتە هەموو ئەوانەش کە لێیانەوە نزیکن، لە هەموو لایەن و بارێکەوە.

٣). هەر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ (الانفال ٣٩). واتە: بیان کوژن و لەناویان بەرن و شەڕو کوشتار بکەن دژی موشریکەکان، هەتا نەبنە مایەی شیرك و فیتنە، وە هەتا تەواوی دین (حوکم و شەریعەت) هەر بۆ خوای گەورە دەبێت. مەبەست لێرەدا بە (الفتنة) شیرکە، وەك ئیبن عەباس و سەدیی و غەیری ئەوانیش لە صەحابە و موفەسرین فەرموویانە...[٢٩]

کاتی هێرش و هجومی بێ باوەران و دەست گرتن یان بەسەر خاك و دیاری ئیسلامدا، ئوممەت لە ژێر هەڕەشە و مەترسی دین دایە، وە لەبەردەم ڕووبەڕوو بونەوەی گومانە لە عەقیدە و بیرو باوەری، بۆیە شەر و کوشتار واجبە بۆ پاراستن و حیمایەتی، دین و گیان و ناموس و ماڵ ...

٤) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: **((لا هجرة بعد الفتح، ولكن جهاد ونية، فإذا استنفرتم فانفروا))**.[٣٠] واتە: لەدوای ڕزگار کردنی مەککەوە هیچ کەس هیجرەت ناکات بۆ مەدینە، بەڵام بە مەبەست و نییەتی جیهاد دەکرێت، ئەگەر فەرمانتان بە ڕاپەرین و دەرچوون پێکرا بۆ سەرخستن و نوصرەتی دین، ئەوە یەکسەر ڕاپەڕن و دەربچن.

---

[٢٩]) القرطبی (٢/٢٥٣).

[٣٠]) متفق علیه : رواه البخاری فی کتاب الجهاد، و رواه مسلم فی کتاب الامارة عن عائشة و ابن عباس .

ئەگەر ئوممەت نەفیری کرد، ئەوە نەفیر واجب دەبێت، وە لەکاتی هێرشی دوژمن بۆ سەر خاکی موسوڵمانان، ئوممەت هەموو لە ژێر حوکمی نەفیر دایە بۆ پاراستنی ئایینەکەی، وە ماوەو مەداری واجبی لەسەر پێویستی موسوڵمانان یان فەرمان و نەفیری پێشەوایە، وەك ئیمامی ئیبن حەجەری عەسقەلانی (رحمە الله) لە شەرح و ڕاڤەی فەرموودەکەدا فەرموویەتی ...

ئیمامی قورطبي (رحمە الله) دەفەرموێت: ((كل من علم بضعف المسلمين عن عدوهم وعلم أنه يدركهم ويمكنه غياثهم لزمه أيضا الخروج إليهم)).[31] واتە: هەرکەس بزانێت بە لاوازی و زوعفی موسوڵمانان، بەرامبەر دوژمنانیان، وە بزانێت کە دەتوانێت بگات و بچێت بە دەمیانەوە، و بەهانایان بگات، ئەویش بەهەمان جۆر واجبە لەسەری بڕوات بەدەمیانەوە بۆ سەرخستن و نوصرەتیان.

٥) هەموو ئایینەکان کە لەلای خوای گەورەوە دابەزیوون، هەمووی بۆ پاراستنی پێنج شتە زەروریاتەکە دابەزیوون، ئەوانیش پاراستنی: دین، گیان، ناموس، عەقڵ، ماڵ.[32]

لەبەر ئەوە پاراستنی ئەم زەروراتە واجبە بەهەر ڕێگاو وەسیلەیەك بێت، وە هەر لێرەدا شەریعەتی ئیسلام ڕوو بە ڕوو بونەوە و بە گژا چونەوەی (صائل)ی داناوە و

---

[31]) فتح الباري لأبن حجر العسقلاني (٣٠/٦).

[32]) تێبینی: خوای گەورە لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆ پاراستنی ئەم (٥) زەڕور یاتە (٥) حوکمی داناوە، ئەوانیش:

١) بۆ پاراستنی گیان (نەفس) ، حوکمی تۆڵە سەندنەوە و (قصاص)ی داناوە.

٢) بۆ پاراستنی (دین) ئایین، حوکمی جیهادو قیتالی داناوە.

٣) بۆ پاراستنی (عەقڵ)، حوکمی لێدان و داری حەدی بۆ خواردنەوەی مەشروب داناوە.، واتە بۆ کەسی مەشروب خۆر.

٤) بۆ پاراستنی (ناموس) حوکمی لێدان و داری حەدو ڕەجمی زینا کاری داناوە.

٥) بۆ پاراستنی (ماڵ)و سامان حوکمی بڕینی دەستی دزی داناوە. وەرگێڕ.

شەرعاندووە ...[٣٣] (صائل) ئەو کەسەیە کە خۆی دەسەپێنێت بەسەر کەسانی تردا بە زۆر و ستەم و، دەیەوێت ماڵ یان گیان یان ناموسی زەوت بکات...

**أ) الصائل على العرض، واتە صائیل لەسەر ناموس:**

ئەگەر موسوڵمانێك دەست درێژی بکاتە سەر ناموسی موسوڵمانێکی دیکە، پێویستە دەفع بکرێت و ڕێگری لێ بکرێت، بە کۆرا و ئیجماعی زانا و فوقەهاکان، ئەگەر کار بگاتە سەر کوشتنیشی، وە هەر لەبەر ئەمەشە فوقەهایان وتەیان لەسەر ئەوەیە کە نابێت بۆ ئافرەت تەسلیم ببێت بە دیلی، هەتا ئەگەر کوژراش، ئەگەر ترسی هەبوو لەسەر ناموسی..

**ب) الصائل على المال والنفس، دەستدرێژکار لەسەر ماڵ و گیان:**

واجبە بەرگری و بە گژا چونەوە بکرێت دژ بەو کەسەی کە دەیەوێت دەست درێژی بکاتە سەرماڵ و گیانی موسوڵمانان، بەلای کۆرا و ئیجماعی زانا و فوقەهاکان، وە یەك دەگرێتەوە لە ڕایەکدا لەگەڵ مەزهەبی (مالکی و شافعی)، ئەگەر ببێتە هۆکاری کوشتنی (صائل)ی موسوڵمان، وەك لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە سەعیدی کوری یەزید دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((من قتل دون دينه فهو شهيد ومن قتل دون دمه فهو شهيد ومن قتل دون ماله فهو شهيد ومن قتل دون أهله فهو شهيد)).**[٣٤] واتە : هەرکەس لەسەر دینی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس لەسەر

[٣٣] ) جامع الأحكام (١٥٠/٨).

[٣٤] ) صحيح: حديث صحيح رواه أحمد وأبو داود والترمذي والنسائي، حاشية ابن عابدين (٣٨٣/٥)، والزيعلي (١١٠/٦)، ومواهب الجليل (٣٢٣/٦)، تحفة المحتاج (١٢٤/٤)، الإقناع (٢٩٠/٤)، والروضة البهية (٣٧١/٢)، والبحر الزخار (٢٦٨/٦)، وتاج العروس صحيح الجامع الصغير للألباني (٦٣٢١).

خوێنی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس لەسەر ماڵی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس لەسەر کەس و خێزانی بکوژرێت ئەوە شەهیدە.[٣٥]

ئیمامی جەصاص (رحمه الله) لە دوای ئەم فەرموودە دەفەرموێت:

((لا نعلم خلافا أن رجلا لو شهر سيفا على رجل ليقلته بغير حق أن على المسلمين قتله)).[٣٦]

واتە: وا نازانم هیچ خیلاف و جیاوازییەك هەبێت لەوەی ئەگەر پیاوێك شمشێرێکی لە پیاوێکی تر ڕاکێشا هەتا بیکوژێت بە ناهەق، ئەوە لەسەر موسوڵمانانە کە بیکوژن و لەناوی بەرنەوە.

لەم کاتەدا ئەگەر دەست درێژ کار (صائل) کوژرا ئەوە لە ئاگر دایە، ئەگەر موسوڵمانیش بێت، خۆ ئەگەر کەسە ستەم لێکراوەکەش کوژرا ئەوە شەهیدە...[٣٧]

---

[٣٥]) هەروەها ئیمامی موسلیم لە فەرموودەیەکی صەحیحدا (١٤٠) لە ئەبو هورەیرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: ((جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي ؟ قَالَ : فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ . قَالَ : أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي ؟ قَالَ : قَاتِلْهُ ؟ قَالَ : أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي ؟ قَالَ : فَأَنْتَ شَهِيدٌ . قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ ؟ قَالَ هُوَ فِي النَّارِ)). واتە: جارێکیان کابرایەك هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بینیت کەسێك هات و ویستی ماڵەکەم زەوت بکات چی بکەم؟ فەرمووی: ماڵ و پارەکەتی پێ نەدەیت، ووتی: ئەی ئەگەر دژم جەنگا؟ فەرمووی: تۆش دژی بجەنگە، ووتی: ئەی ئەگەر کوشتمی؟ فەرمووی : ئەوە تۆ شەهیدی، ووتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ئەوە ئەو لە ئاگری دۆزەخ دایە)).

[٣٦]) أحكام القرآن للجصاص (٢٤٠٢/١).

[٣٧]) قال النووي رحمه الله في شرح مسلم : ((فَفِيهِ جَوَاز قَتْل الْقَاصِد لِأَخْذِ الْمَال بِغَيْرِ حَقّ سَوَاء كَانَ الْمَال قَلِيلًا أَوْ كَثِيرًا لِعُمُومِ الْحَدِيث . وَهَذَا قَوْلٌ لِجَمَاهِير الْعُلَمَاء . وَقَالَ بَعْض أَصْحَاب مَالِك لَا يَجُوز قَتْله إِذَا طَلَبَ شَيْئًا يَسِيرًا ، كَالثَّوْبِ وَالطَّعَام ؛ وَهَذَا لَيْسَ بِشَيْءٍ ، وَالصَّوَاب مَا قَالَهُ الْجَمَاهِير. وَأَمَّا الْمُدَافَعَة عَنْ الْحَرِيم فَوَاجِبَة بِلَا خِلَاف . وَفِي الْمُدَافَعَة عَنْ النَّفْس بِالْقَتْلِ خِلَاف فِي مَذْهَبنَا وَمَذْهَب غَيْرنَا . وَالْمُدَافَعَة عَنْ الْمَال جَائِزَة غَيْر وَاجِبَة وَاَللَّه أَعْلَم . وَأَمَّا قَوْله صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( فَلَا تُعْطِهِ ) فَمَعْنَاهُ لَا يَلْزَمك أَنْ تُعْطِيَهُ وَلَيْسَ الْمُرَاد تَحْرِيم الْإِعْطَاء )) انتهى

وجاء في "الموسوعة الفقهية" (٣١٨/٣٢) تحت عنوان : القتال دفاعا عن العرض والنفس والمال : " إِذَا تَعَرَّضَ شَخْصٌ لِإِنْسَانٍ يُرِيدُ الِاعْتِدَاءَ عَلَى نَفْسِهِ أَوْ أَهْلِهِ أَوْ مَالِهِ : فَإِنْ أَمْكَنَهُ رَدُّهُ بِأَسْهَلِ طَرِيقَةٍ مُمْكِنَةٍ فَعَلَ ذَلِكَ ، وَإِنْ لَمْ يُمْكِنْ رَدُّهُ إِلَّا

ئەمە حوکمی موسوڵمانێکی (صائل) دەست درێژ کارە، ئەی باشە چی ئەگەر بێ باوەڕان دەست درێژی بکەنە سەر خاکی موسوڵمانان، کە دین و ناموس و گیان و ماڵ دەڕۆن بەرەو تیا چوون، ئایا لەم کاتەدا واجب نییە لەسەر موسوڵمانان کە ڕوو بە ڕووی دەست درێژ کاری بێ باوەڕ و دەوڵەتی بێ باوەڕان ببنەوە ؟!

٦) کردنی گیراوەکانی موسوڵمانان بە قەڵغان (سوپەر) لەلایەن بێ باوەڕانەوە:

ئەگەر کافر و بێ باوەڕان ئەو دیل و بارمتە موسوڵمانانەی لایانە کردیاننە قەڵغان ڕووبە موسوڵمانان، واتە کردنیانە پێش خۆیانەوە بۆ پاراستنی خۆیان لە هێرشی موسوڵمانان، وە هاتنە پێشەوە ڕوو بە خاکی موسوڵمانان بۆ داگیر کردنی، ئەوە شەڕ و کوشتار و ڕووبەڕوو بونەوەی بێ باوەڕان واجبە، هەرچەندە ببێتە مایەی تیا چوون و کوشتنی موسوڵمانە بارمتەکانی ژێر دەستی بێ باوەڕان (واتە ئەوانەی کە بێ باوەڕەکان کردویانن بە قەڵغانی خۆیان) .

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمه الله) لە (مجموع الفتاوی) دا دەفەرموێت:

((بل لو فيهم – الكفار – قوم صالحون من خيار الناس ولم يمكن قتالهم إلا بقتل هؤلاء لقتلوا أيضا، فإن الأئمة متفقون على أن الكفار لو تترسوا بأسرى المسلمين وخيف على المسلمين إذا لم يقاتلوا فإنه يجوز أن نرميهم – ونقصد الكفار – ولو لم نخف على المسلمين جاز رمي أولئك المسلمين أيضا على أحد قولي العلماء)).[٣٨]

واتە: بەڵکو ئەگەر لە ناو بێ باوەڕەکاندا گەلێکی چاك و صالح و هەڵبژاردەیان لە چاکترین کەس تێدا بێت، بەڵام شەڕ و کوشتاری بێ باوەڕان نەکرێت تەنها ئیلا بە کوشتن و لە ناو بردنی ئەو کۆمەڵە چاك و صالحە نەبێت، ئەوە ئەوانیش لەگەڵ بێ باوەڕان

---

بِالْقِتَالِ قَاتَلَهُ ، فَإِنْ قُتِلَ الْمُعْتَدَى عَلَيْهِ فَهُوَ شَهِيدٌ ، وَإِنْ قُتِلَ الْمُعْتَدِي فَلَا قِصَاصَ وَلَا دِيَةَ . وَهَذَا فِي الْجُمْلَةِ ...". اهـ وهذا تلخيص مذاهب الفقهاء، من حيث الجملة، ولهم ـ بعد ذلك ـ تفاصيل فيما يتعلق بالدفع عن النفس أو العرض أو المال من أحكام .

[٣٨] ٨٢/٥٣٧

دەکوژرێن —واتە بە ناچاری—، چونکە هەموو پێشەوا و ئەئیمەکان پێك هاتوون و موتەفیقن لەسەر ئەوەی ئەگەر بێ باوەڕان موسوڵمانە بارمتەکانی ژێر دەستی خۆیان کردە قەڵغان (سوپەر) بۆ پاراستنی گیانی خۆیان، وە موسوڵمانەکان مەترسی یان لەسەر بوو، ئەگەر شەڕ نەکەن، ئەوە دروستە بۆردومان بکرێن بە نیاز و مەبەستی بێ باوەڕان، خۆ ئەگەر لەبەر مەترسی نەبێت لەسەر موسوڵمانان، ئەوە بەهەمان جۆر بۆردومان کردنی ئەو موسوڵمانانەش ڕێگە پێدراو بوو، لەسەر یەکێك لە وتەکانی زانایان.

هەروەها لە لاپەڕەی (٤٥) دا دەفەرموێت: ((والسنة والإجماع متفقان على أن الصائل المسلم إذا لم يندفع صوله إلا بالقتل قتل، وإن كان المال الذي يأخذه قيراطا من دينار، ففي الصحيح: "من قتل دون ماله فهو شهيد")).

واتە: سوننەت و ئیجماع کۆران لەسەر ئەوەی ئەگەر دەست درێژ کاری موسوڵمان، شالاو و دەست درێژ کاری یەکەی تەنها بە کوشتن نەبێت لا نەچێت، ئەوە دەکوژرێت، خۆ ئەگەر ئەو ماڵ و پارەی کە دەیبات تەنها (قیراط) یێك دینار بێت، چونکە بە صەحیحی هاتووە: **هەر کەس لەسەر ماڵ و سامانی بکوژرێت شەهیدە.**

لەبەر ئەوەی پاراستنی تەواوی موسوڵمانان، لە فیتنە و شیرك و، پاراستنی دین و ناموس و شەرەف و ماڵ و سامانیان، لە پێشترە لە مانەوەی ژیانی هەندێك لە موسوڵمانان، ئەوان بارمتە و ئەسیر بن بە دەستی بێ باوەڕانەوە و بکرێنە قەڵغان ...

٧) شەڕ و کوشتار کردن دژی دەستەی یاخی (باغیە):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (الحجرات: ٩). واتە: ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕ داران پێکەوە بە جەنگ و شەڕ هاتن، بە هەموو تواناتانەوە ئاشت یان بکەنەوە و بانگ یان بکەن بۆ لای فەرمانەکانی خوای گەورە، جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژی

کردە سەر دەستەکەی تر، ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو دەستە دەست درێژ کارە بەشەڕ بێن، هەتا ناچار دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیاری خوا، جا ئەگەر گەڕانەوە بۆ حوکمی خوا ئێوەش بە داد گەری و ئینصافەوە ناوبژییان بکەن.[٣٩]

ئەمە حوکمی ئەو کەسە شەڕ کەرانەیە کە موسوڵمانن، کە تەواوی موسوڵمانان دەترسێنن و فەساد دەنێنەوە لە زەویدا، و یاری بە ناموس و ماڵی خەڵکی دەکەن .

هەروەها بە صحیحی لە (بوخاری) و (موسلیم) دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی بە هەردوو هۆزی (العرنیین و عوکەل) کرد و، کە ئەنەسی کوری مالیك دەگێڕێتەوە : **((قَدِمَ عَلَى النَّبِيَ صلى الله عليه وسلم نَفَرٌ –وفي رواية : رَهْطٌ– مَن عُكَل أو عُرَيْنَة فَأسلَموا وَاجتَوَوُا الْمَدينَة ، فَأمَرَهُم أن يَاتوا إبلَ الصَّدَقَةِ فَيَشربوا مِن أبوالِهَا وَألبَانِهَا فَفَعَلوا فَصَحوا ، فَارتَدوا وَقَتَلوا رُعاتَها وَستاقوا الإبلَ، فَبَعَثَ في آثارِهِم فَأُتِيَ بِهِم فَقَطَعَ أيديَهُم وَأرجُلَهُم وَ سَمَلَ أعيُنَهُم ، ثُمَ لَم يَحسِمْهُم حَتى ماتوا ، قالَ أبو قِلابَة هؤلاءِ قَومٌ سَرَقوا وَقَتَلوا وكَفَروا بَعدَ إيمانِهِم ، وَحارَبوا الله وَرَسولَهُ)).**[٤٠] واتە: نەفەرێك یان کۆمەڵێك کە شەش یان حەوت کەس لە هۆزی عوکەل یان عورەینە هاتنە مەدینە ، بەڵام ئاو و هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت و توشی ژانە سك (سکچون) بوون ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

---

[٣٩]) ئیمامی (بوخاری) و (موسلیم) و غەیری ئەوانیش لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەدا بە صەحیحی لە ئەنەسی کوری مالیکەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە سواری گوێ درێژێك لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسوڵمانەکان دێت بۆلای، جا کاتێك گەیشت (عبدالله ی کوری ئوبەی) مونافیق بە پێغەمبەری خوای ووت: ((إليك عني، فوالله لقد آذاني نتن حمارك)). واتە لێم دووربکەوە، سوێند بە خوا بۆگەنی کەرەکەت نارەحەتی کردم، لەولاوە (عبدالله ی کوری رەواحە) هەڵی دایە و فەرمووی: (( والله لنتن حمار رسول الله صلى الله عليه وسلم أطيب ريحا منك )). سوێند بە خوا بۆگەنی کەرەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆر لە بۆنی تۆ خۆشترە))، لەو لاشەوە پیاوێکی خزمی عبدالله ی کوری سەلول هەڵی دایە و لەگەڵ پیاوێکی خزمی عبدالله ی کوری رەواحە بوویە دەمە بۆڵەیان و دەرەنجام بە پێڵاو و تاکە نەعل و مستە کۆڵە هاتن بە یەکدا و خەریك بوو شتەکە گەورە ببێت، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارد ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ....﴾.

[٤٠]) متفق عليه : رواه البخاري (٦٨٠٢) و (٦٨٠٣) و (٦٨٠٤) و (٦٨٠٥) ، ومسلم (٩) و (١٦٧١) .

فەرمانی پێدان کە بچن لە شیر و میزی ئەو وشترە بخۆن کە هی خێر بوو (غەنیمەت) کرابوو، وە لەژێر ئەمری پێغەمبەردا بوو ، پاشان چون میز و شیری وشترەکەیان خوارد هەتا چاك بوونەوە، کە چاك بوونەوە لە نەخۆشییەکە نیعمەتی خوایان گۆڕی بە کوفر و ، شوانەکەیان کوشت و شیشێکی ئاگراویشیان کرد بە چاویدا و، وشترەکەش یان دزی و رایان کرد و لە مەدینە دەرچوون، پێغەمبەری خواش هەر پاش نوێژی بەیانی سریەیەکی نارد و پێش ئەوەی خۆر هەلبێ دەست گیری کردن ، پاشان دەست و قاچی هەر هەموویانی بڕی و چاویانی دەرهێنان و کردنییە ناو پێستەی حەیوانەوە و فڕێی دانە بەر گەرمای تیشکی خۆر هەتا لە بەر ئازار و تونییەتی مردن، ئەبی قەلابەش فەرمووی : ئەوانە تاقمێك بوون کە لە ئیسلام (مورتەد) هەلگەرانەوە پاش ئەوەی ئیمان یان هێنا ، وە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد.[41]

ئەمە بۆ تاقمێك بوون، ئەی چی بە دەولەتێکی کافر و بێ باوەڕ، کە دین و دونیا و ناموس و مالی خەلکی فاسید دەکات، ئایا شەڕ و کوشتاریان واجب تر و لە پێش تر نییە لە سەر موسولمانان ؟!

ئەمانە هەندێك بەلگە و هۆکار بوون بۆ دەرچوون و ڕاپەڕین (نەفیر)ی هەموو موسولمانان بۆ جیهاد و تێکۆشان، ئەگەر بێ باوەڕان هاتنە ناو خاکی موسولمانان و داگیریان کرد.

دوورخستنەوە و ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمنی بێ باوەڕ، واجب ترین کارە پاش ئیمان هێنان، وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمه الله) دەفەرموێت:

---

[41]) ئیبن حەجەری عەسقەلانی شەرحی ئەم فەرموودەی زۆر بەباشی کردووە لە (فتح الباری ، بەرگی ١٢ لاپەری ١٣٣ ) لەگەل شەرحەکەی شێخ عثیمین (بەرگی ٩ لاپەرەی ١٢٤) .... ئەوەی کە پێویست بوبێت لەم بارەوە بێ دەستکاری کردن نەقلم کردووە ، وە ئیمامی شەوکانیش شەرحێکی جوانی بۆ کردووە.

((فالعدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه)).[٤٢] واتە: ئەو دوژمنە فاسیدو دەست درێژ کارە (صائیل)ەی کە دین و دونیا فاسید دەکات هیچ شتێك واجب تر نییە لە دوای ئیمان لە ڕووبە ڕوو بوونەوەی و دوور خستنەوەی و شەڕو کوشتار کردن دژی.

## حكم القتال الآن في فلسطين وأفغانستان:

## حوکمی شەڕو کوشتارکردن دژی بێ باوەڕان و داگیرکەران لە ئێستادا لە فەڵەستین و ئەفغانستان و تەواوی خاکە داگیرکراوە کانی دیکەی ئیسلامی وەك (عێراق و صۆماڵ و مەغریب و جگە ئەوانیش)

لە پێشدا بۆمان دەرکەوت و ڕوون بویەوە بۆمان، ئەگەر بستێك لە خاکی موسوڵمانان دەست درێژی کرایە سەر، ئەوە جەنگ و جیهاد فەرز دەبێت لەسەر هەموو خەڵکی ئەو ناوچە و لەسەر نزیکترین شوێنیش لەو ناوچەوە، خۆ ئەگەر ئەوان بەشی پێویست نەبوون یان کەم تەرخەم بوون یان نەیان توانی هەستن بەو کارە، ئەوە حوکمی فەرزی عەین بەسەر تەواوی ناوچەکانی دیکەی دەوروبەری فەرز دەبێت، پاشان حوکمی فەرزی عەین درێژ دەبێتەوە، هەتا تەواوی زەوی دەگرێتەوە بە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاواوە ...

ئیتر لەم کاتەدا هیچ کام لە ئافرەت پرس و ڕوخسەت لە مێردەکەی و کوڕ لە دایك و بابی و قەرز دار لە خاوەن قەرز وەرناگرێت، واتە هەموویان بە بێ پرس دەچن بۆ جەنگ و جیهاد، دژی داگیر کەری بێ باوەڕ، هەروەها :

١) تاوان هەر دەمێنێتەوە بە گەردنی هەموو موسوڵمانانەوە، هەتا خاکێك یان پارچە خاکێك لە خاکی موسوڵمانان بە دەستی بێ باوەڕانەوە بێت.

---

[٤٢]) الفتاوى الكبرى (٤/٦٠٨).

٢) تاوان زیاد دەکات بە پێی توانا و ئیمکانیات و دەسەلاّت، تاوانی زانایان و قادە و ...نگ خوازە گەورەکان لە کۆمەڵگاکانیاندا زۆر زیاتر و توند ترە لە تاوانی نەزان و خەڵکە کەی دیکە ....

٣) پاشان پشت هەڵکردنی گەنجان لە دەرچوون و ڕاپەڕین بۆ قەزیە هاوچەرخەکانی وەك ئەفغانستان و فەڵەستین و فلیبین و کشمیر و لوبنان و تشاد و ئەریتریا و (صۆمال و مەغریب و عراق و غەیری ئەوانیش) زۆر خراپ ترە لە تاوانی ڕوخان و لە دەست دانی خاکە ئیسلامی یەکانی پێشو، نەوەیەك زیندویان کردنەوە کە ڕۆشتن ...

ئێمە بەردەوام دەڵێین: پێویستە ئێستا هەوڵەکانمان زیاتر بکەین لەسەر ئەڤغانستان و فەڵەستین و، زیاتر گرنگ یان پێ بدەین، چونکە باس و قەزییەکی ناوەندی و مەرکەزیین، وە دوژمنی داگیرکەر بەرنامەیەکی بەرفراوانی لە تەواوی ناوچەکەدا دارشتووە و ئامادە کردووە، وە لەبەر ئەوەی لە چارە کردنیدا چارەیە بۆ زۆرێك لە باس و قەزییەکان لە تەواوی ناوچەی ئیسلامیدا و پاراستنی، پاراستنە بۆ تەواوی ناوچەکە.

**سەرەتا لە ئەفغانستانەوە:**

هەرکەس لە عەرەبەکان توانای هەیە جیهاد بکات لە فەڵەستین ئەوە لەسەر یەتی دەست پێ بکات، وە هەرکەسیش ناتوانێت ئەوە لەسەر یەتی بچێت بۆ خاکی ئەفغانستان، بەلاّم باقی موسوڵمانانی دیکە من وای دەبینم کە سەرەتای جیهادیان لە ئەفغانستانەوە بێت، ئێمە وای دەبینین سەرەتا لە ئەفغانستانەوە پێش فەڵەستین لەبەر ئەوە نییە کە ئەفغانستان گرنگتر بێت لە فەڵەستین، بەڵکو فەڵەستین قەزیەی یەکەمی ئیسلامە، وە دڵی جیهانی ئیسلامی و خاکێکی پیرۆزە، بەلاّم کۆمەڵە هۆکارێك هەیە کە دەبنە مایەی ئەوەی جیهاد لە پێشدا لە ئەفغانستانەوە بکرێت پێش فەڵەستین، لەوانەش:

١) شەڕ و کوشتار لە ئەفغانستان ئێشتا بەردەوامە، وە لە توندترینیان شەڕی چیاو شاخەکانی (هندۆکۆشە)[٤٣] لە ئەفغانستان، کە تائێستا مێژوی ئیسلامی لە ماوەی چاخەکانی ڕابردوویدا شتی وای بە خۆیەوە نەبینیوە ....

٢) رایە و پەیداخ لە ئەفغانستاندا رون و ئاشکراو وازحە، ئەویش (لاإلە إلاالله محمد رسول الله)، وە مەبەست و غایەکەش ئاشکرایە (لتكون كلمة الله هي العليا) ، وە لە دەقی دەستوری یەکێتی ئیسلامی موجاهیدەکانی ئەفغانستان لە مادەی (٢) دا هاتووە : (مەبەست لەم یەکێتی یە بریتیە لە دامەزراندن و بنیات نانی دەوڵەتێکی ئیسلامی یە لە ئەفغانستان)، وە هەروەها لە مادەی (٣) دا هاتووە: (مەبەستی ئێمە خۆی لە وتەی خوای گەورە (إن الحكم إلا لله) گرتووە، حاکمیەتی تەواو بۆ خوای هەموو جیهانەکانە).

٣) لە پێشتریشدا ئیسلامی یەکان و جگە ئەوانیش بونە قیادە و پێشەوای شەڕەکان لە ئەفغانستان، وە ئەوانەی جیهاد دەکەن لە ئەفغانستان نەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی و زانایان و قورئان خوێن و حافیزەکانن، بەڵام ئەم شتە لە فەڵەستیندا جیاوازە، لە پێشتریشدا کە سانی جۆراو جۆر قیادەیان گرتۆتە دەست، کە موسوڵمانی راستگۆ یان تێدایە و شیوعی و موسوڵمانی سادە و ساویلەکش یان تێدایە، وە ئاڵا و پەیداخی دەوڵەتی عەلمانی یان بەرز کردەوە ...

٤) هەتا ئێستاش لە ئەفغانستان باس و مەسەلەکە کە بەدەستی موجاهیدەکانەوەیە، وە هەتا ئێستاش یارمەتی یان لە دەوڵەتە شیرکی یەکانەوە رەت دەکەنەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا شۆڕشی فەڵەستینی هەمووی پشتی بەستووە بە یەکێتی سۆڤی یەتەوە، وە ڕوسیا لە خراپترین کاتدا پشتی تێکردن کە ڕووبەڕووی دواڕۆژی خۆیان دەبونەوە لەبەردەم موئامەرەی جیهانی، وە باس و قەزی یەکەیان بۆتە یاری یەك بە

---

[٤٣]) هیندۆکۆش: یەکێکە لەو چیا سەختانەی باکوری ئەفغانستان کە لە چیاکانی کشمیرەوە درێژ دەبنەوە، ئەگەر کەسێك بە چاوی خۆی ئەم چیایانە ببینێت ئەوە سەری سور دەمێنێ، کە ئەم زنجیرە چیا زۆر سەخت و ساردن...

دەست دەوڵەتە زل هێز و گەورەکانەوە، کە یاری و موئامەرە بە خاك و ئەرز و ناموس و گەلی فەلەستینەوە دەکەن ...

٥) هەروەها سنوری ئەفغانستان کراوەیە بەڕووی موجاهیدەکاندا، کە زیاتر لە (٣٠٠٠) کم سنور بەڕوویاندا کراوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەوورو بەری ئەفغانستان ناوچەی خێڵەکین، کە هیچ کات ناکەونە ژێر دەسەلاتی سیاسی یەوە، ئەمەش قەڵغانێکی قایم و پتەو دروست دەکات بۆ موجاهیدەکان، بەلام لە فەڵەستین شتەکە جیاوازە بە تەواوەتی، تەواوی سنورەکان داخراوە، وە دوژمنان دەست یان کراوەیە و چاوی بەرپرسەکان بەسەر هەموو ئەو کەسانەوەیە کە دەیانەوێت سنورەکان ببەزێنن بۆ شەڕ و کوشتاری یەهودی یەکان .

ئیمامی شافعی (رحمه الله) لە پەرتوکی (الام) دا دەفەرموێت:

((فإن اختلف حال العدو فكان بعضهم أنكى من بعض أو أخوف من بعض، فليبدأ الإمام بالعدو الأخوف أو الأنكى ولا بأس أن يفعل، وإن كانت داره أبعد إن شاء الله تعالى حتى ما يخاف لمن بدأ به لما لا يخاف من غيره مثلا، وتكون هذه بمنزلة الضرورة، لأنه يجوز في الضرورة ما لا يجوز في غيرها، وقد بلغ النبي صلى الله عليه وسلم عن الحارث بن أبي ضرار أنه مجمع له فأغار النبي صلى الله عليه وسلم وقربه عدو أقرب منه وبلغه أن خالد بن أبي سفيان بن شح يجمع له فأرسل ابن أنيس فقتله وقربه عدو أقرب)).[٤٤]

واتە: ئەگەر چۆنییەتی حاڵی دووژمن جیاواز بوو، بەوەی هەندێکیان سەرسەخت و خراپتر بوون لە هەندێکی تریان ، یان مەترسی دارتر بوو لە وانی دیکە، با پێشەوای موسوڵمانان لە پێشدا دەست بکات بە کوشتاری دوژمنە مەترسی دارەکە یان سەرسەخت ترەکەیان، ئەمەش کێشە نییە لە کامیانەوە دەست پێ بکات، با ئەو دوژمنەش دوورتر بێت، هەتا ترسی نەبێت بەوەی کە لە کێوە دەستی پێکردووە، وەك چۆن بۆ نمونە

[٤٤]) ج٤ / ص١٧٧.

ناترسێت لەوی دیکەیان، ئەمەش لە شوێن و مەنزیلەی زەروریاتە، چونکە ئەوەی لە کاتی زەروری و ناچاری دروستە لە کاتی دیکەدا دروست نییە، هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیستی کە (حارثی کوری أبي ضرار) خەڵك کۆ دەکاتەوە بۆ جەنگ دژی موسوڵمانان، بۆیە پێغەمبەری خوا هێرشی کردە سەر، لە کاتێکدا دوژمنی نزیکتر هەبوو، هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بیستی کە (خالد کوری أبی سوفیان) خەڵکی کۆدەکاتەوە بۆ شەر دژی موسوڵمانان، بۆیە پێغەمبەری خوا (ئیبن ئەنیسی) ناردو (خالدی کوری ئەبی سوفیان)ی کوشت، لە کاتێکدا کە دوژمنی نزیك تر هەبوو.

٦) پاشان گەلەکەی تاك و بێ وێنەیە لە جوامێری و ئازایەتی و عیزەتدا، وەك بڵەی خوای گەورە شاخ و خاکەکەی هەر بۆ جیهاد ئامادە کردووە .[٤٥]

---

[٤٥] ) تێبینی: بێگومان ئەمەی شێخ عبدالله عەزام نوسیویەتی و باسی دەکات، شتێکی راستەو مێژوو شاهیدی ئەم راستی یەیە، زۆرمان بینی لە شۆرش و جیهادەکانی ولآتانی دەوروبەرمان، کە زۆربەیان لە کۆتاییدا بەرهەمەکەی چووە بەرژەوەندی ئەو کەسانەی کە رۆژێك لە رۆژان سەعاتێك نەچووبونە سەنگەرو رو بەرو بونەوەی دوژمنانی ئیسلام. بەڵام خۆ بینی مان چۆن ئەو شەعبە بە فەزڵ و یارمەتی خوای گەورە توانیان روو بەروی سوپای سۆڤیەتی روسی بوەستنەوەو لە خاکی ئەفغانستان دەریان بکەن و بیان شکێنن، ئەمەش فەزڵی خوای گەورەیە بەسەر ئەو شەعبەوە، پاشان لای هەمووشمان ئاشکرایە کە ئەوان شوێن کەوتەی ئیمامی ئەبو حەنیفەن، وە ئەوان موقەلیدی ئەون، بۆیە ئەگەر شتێك لە فیقە و مەنهەجی ئەبو حەنیفەدا هاتبێت لای ئەوان گۆرینی بۆ نییە، لەبەر ئەمەش ئەگەر تەواوی دونیا پشت یان تێ بکەن ئەوان هەر لەسەر جیهادو تێکۆشانی خۆیان بەردەوام ئەبن، هەر بۆیە شێخ عبدالله عەزام دەگێرێتەوە: جارێك لە کابرایەکی ئەفغانیان پرسی تەمەنت چەندە؟ وتی (٤٠)ساڵم، دوای (٤٠) ساڵ لێیان پرسییەوە ئێستا تەمەنت چەندە؟ وتی (٤٠) ساڵ!، وتیان تۆ پێش چل ساڵ تەمەنت ئەوەندە بوو، ئێستا هەشتا ساڵیت و چل نیت، کابرای ئەفغانی وتی نەخێر، ئەفغانی یەك جار قسە ئەکەن و نایگۆرن، من هەر چل ساڵم! !، وە ئێستاش ئەگەر لێیان بپرسیت ئێوە بەو تواناو رێژە کەمەتانەوە سەردەکەون یان دوژمنە کانتان؟ ئەڵێن: ئێمە، چونکە هەق بە ئێمەیەو ئێمە لەسەر هەقین، وە خوای گەورەش تەنها هەق سەردەخات، بۆیە ان شاء الله بە یەقین هەر ئێمە سەردەکەوین! / ئەو شەعبەی کە لە هەموو لایەکەوە موئامەرەو خیانەتی لێ دەکرێت، کەچی زۆر ئازاو خۆ راگرانە هەر لەسەر جیهاد و شەرکردن پێداگرن، خۆلای هەمووشمان سەرماو سەختی چیاکانی نورستان ئاشکرایە، کە بەردەوام زیاتر لە (٣٠) پلە لە ژێر سفرەوەیە، هەتا بەو ئەندازەی بزنە کێوی یەکان خۆیان لە شاخەکانەوە فرێ ئەدەنە خوارەوە و خۆیان ئەکوژن لەتاو سەرمای

# فەرزی عەین و فەرزی کیفایەت

**فەرزی عەین:** ئەو فەرزەیە کە پێوستە لەسەر هەموو موسولمانێك خۆی ئەنجامی بدات، وەك نوێژو ڕۆژوو .

**فەرزی کیفایەت:** ئەو فەرزەیە کە ئەگەر هەندێك لە موسولمانان هەستن پێی لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێت، وە واتای فەرزی کیفایەت ئەوەیە ئەگەر ئەوانەی هەڵنەسن بە ئەنجام دانی هەتا لەسەر ئەوانی دیکە لا بچێت ئەوە هەموو خەڵکی تاوان بار دەبن، خۆ ئەگەر ئەوانەی هەستان پێی بۆ کیفایەت ئەوە لەسەر تەواوی خەڵکی دیکە لادەچێت، بەلام لە سەرەتادا بانگەواز هەموو خەڵکی بۆ فەرزی عەین دەگرێتەوە، پاشان جیا دەبنەوە لەوەی کە فەرزی کیفایەت لادەچێت بە ئەنجام دانی هەندێك کەس، بەلام فەرزی عەین بە ئەنجامدانی کەسانی دیکە لا ناچێت .[٤٦]

هەر لەبەرئەوە ئیمامی فەخری رازی فەرزی کیفایەتی بەم جۆرە ناساندووە: ((يقصد حصوله من غير النظر بالذات إلى فاعله)).[٤٧]

هەروەها ئیمامی شافعی دەفەرموێت: ((إن الواجب الكفائي مطلوب على العموم ومراد به الخصوص)).[٤٨] واتە: واجبی کیفایەت داوا کراوە لەسەر هەمووان، بەلام چەند کەسێك ئەنجامی بدات بە تایبەتی.

---

سەخت، بەلام نەمان بیست ڕۆژێك موجاهیدێكی ئەفغانی پشت لە سەختی و سەرمای ئەو شاخانە بكەن و لە ئەمرو فەرمانی ئەمیر دەربچن و بێنە خوارەوە، وە بە جوتێك پاتەی لاسیكی بێ گۆرەوییەوە شەرو كوشتاری سۆڤیەتی روسییان دەكرد، ئێستاش زۆر لە جاران ئازاترانە دژی ئەمریكا ...!/ وەرگێر

[٤٦]) المغني لابن قدامة (٨/٣٤٥).

[٤٧]) أنظر المحصول للرازي تحقيق الدكتور طه جابر ج القسم (٢) ص(٣١).

[٤٨]) أصول الفقه لأبي زهرة.

ئەوەی کە تەواوی (ئوصولی)یەکان لەسەری یەك دەنگ و کۆڕان، لەوانە (ئیبن الحاجب) و (ئامەدی) و (ئیبن عبدالشکور)، ئەوەیە کە: ((أن فرض الکفایة یجب علی الکل ویسقط بفعل البعض)). واتە: فەرزی کیفایەت لەسەر هەمووان واجبە، واتە واجبی سەر شانی هەموو موسوڵمانێکی موکەلەفە، وە بە ئەنجام دانی هەندێك لە موسوڵمانان لەسەر موسوڵمانانی دیکە لادەچێت و هەڵدەگیردرێت.

بەلأم ئێستا هەندێك لە خەڵکی لە بارەی حوکمی جیهادەوە موجادەلە دەکەن، وە پێیان وایە فەرزی کیفایەتە، وە فەرزیش واجبە لەسەر هەمووان، بەلأم بە ئەنجام دانی لەلایەن هەندێکەوە لەسەر ئەوانی دیکە هەڵدەگیردرێت و لادەچێت، ئەگەر لەسەر ئەو بۆچونە بێت ئەوە فەرزی جیهاد ئێستا لە ئەفغانستان (کە دەڵێت فەرزی کیفائی یە)، واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانان لە تەواوی گۆی زەویدا، هەتا فەرزەکە بە تەواوی جێبەجێ دەکرێت، ئەویش دەرکردنی روس و شیوعی یەکانە لە خاکی ئەفغانستان.[٤٩]، وە تاوان و گوناهیش ملی هەموو موسوڵمانان دەگرێت، هەتا ئەو کاتەی شیوعییەکان دەردەکرێن، چونکە فەرز لە کاتی داگیر کردنی خاکی موسوڵمانان لەلایەن بێ باوەرانەوە، بریتیە لە دەرکردنی بێ باوەران لە خاکی موسوڵمانان ...

قسەیەك هەیە کە زۆربەی خەڵکی بەردەوام دوور لە واقیعی رووداوەکان دەیڵێنەوە، ئەویش دەڵێن: (إن الجهاد في أفغانستان بحاجة إلى مال وليس بحاجة إلى رجال). واتە ئێستا جیهاد لە ئەفغانستان پێویستی بە پارە و مادەیە، نەك بە پیاو، وە بێ گومان ئەم قسەش لە بنەرەتدا دوورە لە راستی یەوە، چونکە رۆشتنی ماوەی شەش ساڵ بەسەر روسەکاندا لە خاکی ئەفغانستان و، کۆچ کردنی زیاتر لە پێنج ملیۆن موسوڵمان بۆ دەرەوە و، حەوت ملیۆن لە ناوەوە بەرەو شاخ و کێوەکان، بەسە بۆ وەلأم دانەوە و رەد دانەوەی ئەم قسەیە ...

---

[٤٩] ) دیارە شێخی موجاهید (عبدالله عزام) کاتی داگیر کردنی ئەفغانستان لەلایەن روسی یاوە ئەم کتێبەی نووسیوە، بەلأم پاش رزگار کردنی خاکی ئەفغانستان لەلایەن موجاهیدانەوە، دووبارە ساڵی (٢٠٠١) لەلایەن سوپای (ئەمریکا) و (ناتۆ)وە داگیر کرایەوە . وەرگێڕ.

هەروەها وەك سەیاف دەڵێت: ((چوارده وڵات لەپێش هەمووشیانەوە یەکێتی سۆڤیەت و، حیلفی وارسۆ و، شیوعی یەتی نێو دەوڵەتی، هەموویان پێکەوە ئێمەیان کردۆتە یەك کەوانەوە، بەڵام کەچی ئێشتا موسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا موناقەشەی ئەوە دەکەن، ئایا جەنگ و جیهاد لە ئەفغانستان فەرزی عەینە یان کیفایەت؟ دەبا موسوڵمانان چاوەڕێ بکەن هەتا شەهید بوونی کۆتا پیاو لە ئەفغانستان، ئیتر ئەو کاتە باوەر دەکەن کە جیهاد فەرزی عەینە، لەگەڵ ئەوەشدا (مع العلم) تا ئێستا زیاتر لە (ملیۆنو نیوێك) کەس لەسەر خاکی ئەفغانستان لەناو چوون)).

ئەفغانییەکان بەردەوام دەڵێن: (وجود عربي واحد بيننا أحب إلينا من مليون دولار). واتە: بوونی تەنها یەك عەرەب لەناو ماندا، خۆشەویسترە لامان لە ملیۆنێك دۆلار...

هەروەها مامۆستا (سەیاف) بانگەوازێکی کرد بۆ زانایان و بانگ خوازان، کە لە گۆڤاری (جیهاد) ژمارەی نۆیەم بڵاو کرایەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن واهتدى بهديه.

أما بعد:

إنكم تعرفون أن الجهاد في أفغانستان ابتدأ ولا زال مستمرا لإعلاء كلمة الله، ولإقامة دولة القرآن، وبما أن تحقيق هذا الهدف يحتاج إلى مجاهدين يعرفون الإسلام على حقيقته ويستطيعون أن يحافظوا على أصالة الجهاد الإسلامي، فلا بد من وجود علماء ودعاة يقومون بالتوعية والتوجيه بصفة مستمرة، وللعلم فإن كثيرا من العلماء والإخوة المربين في أفغانستان استشهدوا في ميادين الجهاد، فنحن بحاجة ماسة إلى رجال يقومون بالتدريس والتوجيه والتوعية في مدارس المجاهدين ومخيماتهم ومعسكراتهم وجبهاتهم حتى يمكننا الله سبحانه من تحقيق الأهداف المنشودة، وإن حاجتنا إلى العلماء الدعاة أكثر من حاجتنا إلى أي خبير ومتخصص آخر، وفقنا الله وإياكم لخدمة الإسلام والمسلمين.

اخوكم عبد رب الرسول سياف

بكتيا، جاجي

٣ شوال ١٤٠٥هـ

# باسی مەسەلەی پرس وەرگرتن لە دایك و باوك و هاوسەر و خاوەن قەرز

## حوكمی پرسكردن پەیوەستە بەم حاڵەتانەوە :

١) واتە: ئەگەر كەسی موسوڵمان لە خاكی خۆیدا بێت ، مەترسیش لە ئارادا نەبێت بۆ سەر سەنگەرەكان، هیچ داگیر كاری و دەست درێژ كارییەك نەبوو لە لایەن دووژمنەوە بۆ سەر خاكی موسوڵمانان، سەنگەرو شوێنەكانی سوپای موسوڵمانان هەموو پڕی بوو لە سەرباز، ئالەم كاتەدا جیهاد كردن فەرزی كیفایەتە، دەبێت ئیلا پرس و روخسەت وەربگیرێت، چونكە گوێڕایەڵی دایك و باوك و ، هاوسەر فەرزی عەینە، وە جیهادیش لەم كاتەدا فەرزی كیفایەتە، وە ئاشكراشە كە فەرزی عەین لە پێش فەرزی كیفایەتەوەیە.

٢) ئەگەر دوژمن هێرشی كردە سەر پارچەیەك یان بستێك لە خاكی موسوڵمانان، یان چونە ناو شارێك یان وڵاتێك لە وڵاتی موسوڵمانان، لێرەدا وەك باسمان كرد جەنگ و جیهاد دەبێتە فەرزی عەین، لەسەر تەواوی خەڵكی ئەو شارە وە لەسەر ئەوانەی دەوورو بەریشی، وە لەم كاتەدا پرس و روخسەت لادەچێت و نامێنێت، هیچ كەس پرس و روخسەت لە هیچ كەسێكی دیكە وەرناگرێت، هەتا بەو جۆرەی كوڕ بەبێ پرس و روخسەتی دایك و بابی و ، هاوسەر بێ پرس و روخسەتی مێردەكەی و، قەرز دار بێ پرس و روخسەتی خاوەن قەرزەكەی دەڕوات بۆ جەنگ و جیهاد .

لابردن و هەڵگرتنی پرس كردنی كور بە دایك و باوكی و هاوسەر لە مێردی و قەرزدار لە خاوەن قەرزی هەر بەو جۆرە دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت، هەتا دەركردن و ڕۆشتنی دووژمن لە خاكی موسوڵمانان، یان هەتا ئەو كاتەی ڕێژەو ژمارەی موجاهیدان دەگاتە بڕی پێویست بۆ دەركردن و كوشتاری دوژمن، وەلەو ئەگەر تەواوی موسوڵمانانی سەر زەوی كۆببنەوە و ئامادە بن....

جیهاد پێش دەخرێت ئەگەر فەرزی عەین بێت بەسەر گوێڕایەڵی دایك و باوكدا، كە ئەویش (گوێڕایەڵی دایك و باوك) هەر فەرزی عەینە، چونكە جیهاد بۆ پاراستن و حیمایەتی دینە، بەلاّم گوێڕایەڵی دایك و باوك بۆ پاراستن و حیمایەتی گیان و نەفسە، چونكە جیهاد (مظنة حزنهما و تعبهما) جێگەی گومان و چەرمەسەری و نارەحەتی یانە)، وە پارێزگاری لە دین پێشترە لە پارێزگاری لە نەفس وگیان، چونكە جیهاد خۆی لەخۆیدا دانان و بەخت كردنی گیان و نەفسی موجاهیدە ئەگەر شەهید بێت، لە پێناو پاراستنی دینەكەیدا، وە پاراستنی دین یەقینە، وە تیاچوون و رۆشتنی گیان و نەفسی دایك و باوك تەنها گومانە، وە شتێكی ئاشكراشە كە یەقین لەپێش گومانەوەیە.

## مثال فرض العين والكفاية:

## نمونەی فەرزی عەین و کیفایەت:

وەك بوونی كۆمەڵە خەڵكێك لە لێواری دەریایەك، كە مەلە نازانن و خۆیان لە شوێنی قوڵ دەپارێزن، هەندێكی دیكەشیان تێدایە كە مەلەوانن و مەلە بەچاكی دەزانن، دەبینن منداڵێك كەوتۆتە ناو دەریاكەوە و مەلەش نازانێ، و خەریكە نقوم ببێ و بخنكێ، وە هاوار دەكات : فریام كەون فریام كەون، بەلاّم هیچ كام لە مەلەوانەكان ناچن بەدەمییەوە بۆ رزگار كردنی، بەلاّم یەكێك لە مەلەوانەكان دەیەوێت خۆی فڕێ بداتە ئاوەكەوە و منداڵەكە ڕزگار بكات، كەچی باوكی ڕێگری لێ دەكات كە بچێت بۆ ڕزگار كردنی منداڵەكە، ئایا هیچ فەقیهو شارەزایەك لە فەقیهو شارەزاكانی تەواوی چاخەكانی ئیسلامی، دەڵێن یان وتویانە واجبە لەسەر ئەوكەسە كە گوێڕایەڵی باوكی بكات و واز لە ڕزگار كردنی منداڵەكە بهێنێت؟

ئەمە نمونەی ئەفغانستانە ئەمڕۆ، ئێستا هاوار دەكات، و داوای كۆمەكی و هاوكاری دەكات، منداڵەكانی لەناو دەبرێن، وە ناموسی یان ئەتك دەكرێت، وە خەڵكە مەدەنی و داماوەكە بەبێ تاوان دەكوژرێن، وە لاشە و جەستەیان لە هەموو شوێنێك دەبینرێت، ئالەم كاتەدا كۆمەڵێك گەنجی پاكی ڕاستگۆی صادق دەیانەوێت بجوڵێن بۆ ڕزگار كردنیان و

بەدەمەوە چونیان و هاوکاری کردنیان، کەچی یەکێك لەولاوە هەڵدەداتێ و دەڵێت: ئایا چۆن دەڕۆن بەبێ ئیزن و ڕوخسەتی دایك و باوکتان؟

ڕزگار کردنی منداڵێك کە نوقمی ئاو بووە واجبە لەسەر هەموو ئەو مەلە وانانەی کە دەیبینن، بەڵام پێش ئەوەی هیچ کەسێك بجولێت بەرەو ڕزگار کردن و دەرهێنانەوەی منداڵەکە، ئەوە بانگەوازی واجبی ڕزگار کردنی منداڵەکە ڕوو دەکاتە هەموو ئامادە بووەکان، خۆ ئەگەر تەنها کەسێك بجولێت بەرەو ڕزگار کردنی منداڵەکە، ئەوە گوناح و تاوان لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێت، خۆ ئەگەر هیچ کەس نەجولێت بۆ ڕزگار کردنی ئەوە گوناح و تاوانەکە هەموو ئامادە بووەکان دەگرێتەوە، پێش ئەوەی هیچ کەسێك بجولێت بەرەو ڕزگار کردنی منداڵەکە ئەوە ئیزن و ڕووخسەت لە دایك و باب وەرناگیردرێت، ئەگەر باوك ڕێگری کورەکەی بکات لەسەر ڕزگار کردنی منداڵەکە، ئەوە گوێڕایەڵی و ئیتاعەی ناکرێت، چونکە فەرزی کیفایەت سەرەتا بانگەوازەکەی بۆ فەرزی عەینە، بەڵام لە کۆتاییدا جودا دەبنەوە، ئەگەر هەندێك هەستان بە ئەنجام دانی، ئەوە تاوان لەسەر ئەوانەی دیکە لادەچێت، بەڵام ئەگەر هیچ کەسێك هەڵنەستا بە ئەنجام دانی و جێبەجێ کردنی ئەوە هەمووان تاوان بار دەبن.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەی حەرانی (رحمه الله) دەفەرموێت:

((فأما إذا هجم العدو فلا يبقى للخلاف وجه، فإن دفع ضررهم عن الدين والنفس والحرمة واجب إجماعا)).[50] واتە: خۆ ئەگەر دووژمن هێرشی هێنا، ئەوە هیچ خیلافێك نامێنێ بۆ ڕووبەڕو بونەوەی، چونکە دوور خستنەوە و بەگژا چوونەوەی زەرەرو خراپەیان لەسەر دین و گیان و حورمەتی موسوڵمانان واجبە بە ئیجماع.

پاشان دەفەرموێت:

[50] ) الفتاوى الكبرى ٤/٦٠٧.

((فالعدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه)).[٥١] واتـه: ئەو دوژمنە فاسیدو دەست درێـژکارە (صـائیل)ەی کـە دیـن و دونیـا فاسـید دەکـات هـیچ شتێك واجب تر نییە لە دوای ئیمـان لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی و دوور خـستنەوەی و شـەڕو کوشتار کردن دژی.

بەڵگەش لەسەر ئیزن وەرگرتن لە دایك و باوك بۆ فەرزی کیفایـەت و، ئیـزن وەرنـەگرتن لێیان بۆ فەرزی عەین، لەم دوو فەرموودەدا کۆدەبنەوە:

## فەرموودەی یەکەم:

فەرموودەکەی ئیمامی بوخاری (رحمه الله) کە لە عبدالله ی کوری عەمروی کوری عـاص ڕەزای خوایان لـێ بێـت دەگێڕێتـەوە: جارێکیـان پیاوێـك هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) هەتا ئیزنی بـدات بـچێ بـۆ جیهـاد، پێغەمبـەری خـوا پێـی فـەرموو: ((أحَيٌّ والداك؟)) واتـە: دایـك و باوکـت مـاون؟ وتـی: بـەڵێ، فـەرمووی: دەبـڕۆ بـۆ لایـان، چاکەش لەگەڵ ئەوان هەر جیهادە.

---

[٥١]) الفتاوى الكبرى (٤/٦٠٨).

## فەرموودەی دووەم:

ئیبن حەبان لە (عبدالله بن عمرو) خوای لیٚ رازی بێت.[٥٢] دەگێڕێتەوە: [٥٣] جارێکیان کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لیٚ کرد لەبارەی چاکترین و ئەفزەڵ ترین کارەوە، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: (نوێژ)ە، پاشان وتی چیتر؟ فەرمووی: (جیهاد)، کابرا ووتی: من دایك و باوکم ئێشتا لە ژیاندا ماون، پێغەمبەری خوا فەرمووی: **((آمرك بوالديك خيرا))** فەرمانت پێدەکەم کە لەگەڵ دایك و بابتدا چاك بیت، کابراش ووتی: (والذي بعثك بالحق لأجاهدن وأتركهما) سوێندم بەوەی کە تۆی بەهەق ناردووە، ئەچم بۆ جیهاد و وازیان لیٚ دەهێنم و لێیان دەگەڕێم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: **((فأنت أعلم))** واتە تۆ ئەزانیت.

---

[٥٢] ) رواه احمد عن ابن لهيعة عن حويي بن عبدالله، و رواه ابن حبان، سكت عليه الحافظ في الفتح فهو حسن أو صحيح عن عبدالله بن عمرو، أنظر فتح الباري (٦/١٠٥)./ قال الحافظ وهو محمول على جهاد فرض عين، توفيقا بين الحديثين.../

[٥٣] ) ئیبن حەبان بەم جۆرە ریوایەتی فەرموودەکەی کردووە:

روى ابن حبان عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما: جاء رجل الى رسول الله صلى الله عليه وسلم فسأله عن أفضل الأعمال قال: (الصلاة)، قال: ثم مه قال: (الجهاد)، قال: فإن لي والدين، فقال: (آمرك بوالديك خيرا)، فقال: والذي بعثك بالحق لأجاهدن وأتركهما، قال: (فأنت أعلم) ، رواه ابن حبان وصححه وسكت عليه الحافظ في الفتح فهو حسن أو صحيح. قال الحافظ: وهو محمول على جهاد فرض العين توفيقا بين الحديثين ....

## استئذان الشيخ والمربي:

# پرسخواستن لە مامۆستاو پەروەردەکار:

هیچ یەکێك لە زاناو فوقەهاکان لە سەلەف و خەلەف، شتی لەو جۆرەیان نەوتووە کە: شێخ یان مامۆستاو پەروەردەکار ماف و حەقی ئەوەیان هەبێت ئیزن و روخسەت بدەن بە قوتابی، لە بەندایەتی و عیبادەتەکاندا، جا ئەگەر ئەو بەندایەتی یە فەرزی عەین بێت یان کیفایەت، جا هەرکەس شتێك لە جێگەی ئەمە دەڵێت با بە بورهان و بەڵگەی شەرعی یەوە بێت و بۆمان بسەلمێنیٚ، هەموو مرۆڤێکی موسوڵمان بۆی هەیە بچێت بۆ جیهاد بەبیٚ خواستنی پرس و روخسەت لە شێخ و مامۆستاکەی، چونکە روخسەت و ئیزن دانی پەروەردگاری جیهانەکان لەپێش هەر ڕوخسەتێکی دیکەوەیە، ئەو ئیزنی داوە، بەڵکو فەرزی کردووە ...

ئیبن ئەبی (هبیرە) رەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت :

((إن من مكائد الشيطان أن يقيم أوثانا في المعنى تعبد من دون الله، مثل أن يتبين له الحق فيقول: ليس هذا مذهبنا، تقليدا لمعظم عنده قد قدمه على الحق)).[٥٤]

واتە: لە فرت و فێڵەکانی شەیتان ئەوەیە کە کۆمەڵێك بت دادەنێت لە واتای بەندایەتی دا لەجێگەی خوای گەورە، وەك ئەوەی بەندە حەقی بۆ دەرکەوێت و بۆی ڕوون بێتەوە کە چی دەڵێت: ئەمە خۆ مەزهەبی ئێمە نییە، چاولێکردنی تەنها لەبەر گەورەیی ئەو شتەیە لای ئەو، دەیخاتە پێش حەقەوە و سەری دەخات بەسەری دا.

ئەگەر ئەو قوتابی یە بیەوێت بخوێنێت بۆ دیراسەی هەندەسە یان دکتۆری یان مێژوو یان هەر شتێکی دیکە لە ولاَتانی ڕۆژئاوا (غەرب)دا یان ئەمریکا، کە فیتنە وەك پارچەیەك لە تاریکی شەو وایە، ئەڵێم: ئەگەر ئەو قوتابی یە بەبیٚ ئیزن و ڕوخسەتی شێخ یان

[٥٤]) لعقد الياقوتيه (١٠٤)

مامۆستاکەی بڕوات بۆ خوێندن لەو ولآتانە، کە مەسکەن و سەرچاوەی فیتنە و فەسادو رازاندنەوەی هەواو هەوەسە شەیتانی یەکانە، ئەوە نە شێخ و مامۆستاکەی نە هیچ کەسێکی دیکە نکوڵی و لۆمەی ناکات، بەلآم ئەگەر بچێت بۆ ڕیباط یان دەربچێت بۆ جیهاد کردن، ئەوە دەبینیت لەهەموو لایەکەوە زمانی لەسەر درێژ دەکرێت و لۆمە دەکرێت، و دەڵێن: ئەوە چۆن بێ پرس هەر لە خۆیەوە ڕۆشتووە ؟؟

ئەوە شێخەکەی لە دەستی چووە کە وتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ببیستێت کە دەفەرموێت: ((**حرس ليلة في سبيل الله تعالى أفضل من ألف ليلة يقام ليلها ويصام نهارها**)).[٥٥] واتە: یەك شەو پاسەوانی لە پێناوی خوای گەورەدا، ئەفزەڵ ترو خێرترە لە هەزار شەو بە شەونوێژو، ڕۆژەکەی بە ڕۆژوو.

هەر لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە کە سەلمانی فارسی خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**رباط يوم وليلة في سبيل الله خير من صيام شهر وقيامه وإن مات جرى عليه عمله الذي كان يعمله وأجري عليه رزقه وأمن الفتان**)).[٥٦] واتە: ڕیباطی ڕۆژو شەوێك لە پێناوی خوای گەورەدا خێرترە لە ڕۆژووی مانگێك و شەو نوێژەکەی، خۆ ئەگەر ئەو مورابیطە بمرێت، ئەوە خێرو پاداشتی ئەو کارەی هەر بۆ دەنوسرێت کە کردوویەتی، رزقی خۆی بۆ دەنوسرێت و لە فیتنە دەپارێزرێت.

لەسەر شێخ و قوتابییەکەی پێویستە کە پەلە بکەن لەکاری چاکە و خێرو پێش برکێ بکەن بۆی، وە پشت نەکەن لەو ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت: ((**اغتنم خمسا قبل خمس حياتك قبل موتك وصحتك قبل سقمك وفراغك قبل**

[٥٥] ) رواه ابن ماجة والطبراني والبيهقي وصححه الحاكم وأقره الذهبي وقال الحافظ : إسناده حسن أنظر الفتح الرباني (٩٥/١) مختصر صحيح مسلم رقم (١٠٧٥).

[٥٦] ) متفق عليه: رواه البخاري و مسلم .

**شغلك وشبابك قبل هرمك وغناك قبل فقرك)).**[٥٧] واتە: سوود مەند بە لە (پێنج) شت پێش (پێنج) شت، ژیانت پێش مردنت، وە لەش ساغیت پێش نەخۆشیت، وە دەست بەتاڵی و فەراغت پێش سەرقاڵی و مەشغوڵ بونت، وە لاوێتی و گەنجیت پێش پیریت، وە دەوڵەمەندی و سەرمایەت پێش هەژاری و فەقیریت.

پێویستە لەسەر شێخ و قوتابییەکەی گوێ بیستی ئەو فەرموودە صەحیحە بن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **((قيام ساعة في الصف للقتال في سبيل الله خير من قيام ستين سنة)).**[٥٨] واتە: یەك سەعات وەستان لە ڕیزی شەردا لە پێناوی خوای گەورەدا، خێرترە لە شەست ساڵ نوێژ کردن.[٥٩]

ئیمام شافعی (رحمه الله) دەفەرموێت:

((أجمع المسلمون على أن من استبان له سنة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم لم يحل له أن يدعها لقول أحد)).واتە: هەموو موسوڵمانان پێك هاتوون و کۆران، لەسەر ئەوەی هەرکەس سوننەتێکی لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فێربوو، ئەوە بۆی نییە وازی لێ بهێنێت لەبەر قسەی کەسێك.

---

[٥٧] ) صحيح: رواه الحاكم والبيهقي والترمذي برقم (٢٣٣٣) و صححه الالبانى رحمه الله في صحيح سنن الترمذي و صحيح الترغيب والترهيب برقم (٣٣٤١) و مشكاة المصباح (٥١٧٤) و اقتضاء العلم العمل ... وقال حديث صحيح .

[٥٨] ) صحيح: رواه احمد والحاكم والدارمي، وصححه الالبانى رحمه الله في صحيح الجامع الصغير (٤٣٠٥). و(٤٤٢٩).

[٥٩] ) هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە دەفەرموێت: ((موقف ساعة في سبيل الله خير من قيام ليلة القدر عند الحجر الأسود)). واتە: یەك سەعات وەستان لە ڕیزەکانی شەردا لە پێناوی خوای گەورەدا، زۆر خێرترە لە شەونوێژی شەوی قەدر لە بەردەم بەردە ڕەشەکەی کەعبەدا)). صحيح: رواه احمد عن أبي هريرة في مسنده، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الترغيب والترهيب للمنذري برقم (١٢٢٣).

## الجهاد بالمال

# جیهاد بەماڵو سامان

بێگومان جیهاد بە گیان و نەفس گەورەترین پلەی هەیە لە جیهاد کردن بە ماڵ و سامان، هەر لەبەر ئەمە دەوڵەمەند و خاوەن ماڵ و سامانەکان لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) قەت دەست بەرداری جیهاد کردن نەدەبوون بە نەفس وگیانیان، وەك وێنەو هاوشێوەی عوسمان و عبدالرحمن ی کوری عەوف رەزای خوایان لێ بێت، چونکە بەرز راگرتنی نەفس و پەروەردە کردنی رۆحەکان، کاتی رووبەڕو بونەوە لە ساحەکانی جیهادا بەرز دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((**وعليك بالجهاد فإنه رهبانية الإسلام**)).[٦٠] واتە: دەست بگرە بە جیهاد کردنەوە، چونکە روهبانییەتی ئیسلامە)).

هەر لەبەر ئەوە لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا کە سەعدی کوڕی راشد دەگێڕێتەوە: ((**أن رجلا قال يا رسول الله ما بال المؤمنين يفتنون في قبورهم إلا الشهيد؟ قال: كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة**)).[٦١] واتە: جارێکیان کابرایەك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چییە باوەڕدارەکان توشی فیتنە و سزای گۆڕ دەبن، کەچی تەنها شەهیدەکان دەپارێزرێن؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: واتە

---

[٦٠] ) حسن صحيح: رواه احمد، وصححه الالبانی رحمه الالباني في صحيح الجامع الصغير (٤٣٠٥)، وسلسلة الصحيحة (٥٥٥).

تەواوی فەرموودەکە بەم جۆرەیە: (( **أوصيك بتقوى الله تعالى فإنه رأس كل شيء وعليك بالجهاد فإنه رهبانية الإسلام وعليك بذكر الله وتلاوة القرآن فإنه روحك في السماء وذكرك في الأرض** )).

[٦١] ) صحيح : رواه النسائي (٢٠٥٣) وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الترغيب والترهيب (١٣٨٠) و صحيح الجامع الصغير للسيوطي (٤٤٨٣).

ئەوەندە بەسە کە ئەوان لەکاتی ڕوو بەڕوو بونەوە بە شمشێر لەسەریان رایان نەکرد.[٦٢] واتە ئەگەر مونافق و دووڕو بونایە دەیان توانی کاتی شەرو ڕوو بەڕوو بونەوە هەڵبێن و رابکەن، بەلأم ئەوەیان نەکرد، دیارە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئیمان و راستگۆی یان (والله أعلم).

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاگاداری داوە لە سەرقاڵ بوون بە دونیاوە و، پشت هەڵکردن لە جیهاد کردن، وە جارێکیان ئاماژەی بە داسێکی کشتوکاڵ داو فەرمووی: ((**لا يَدخل هذا بيت قوم إلا أدخل الله الذل**)).[٦٣] واتە: ناچێتە ناو ماڵی هیچ گەل و قەومێکەوە، ئیلا خوای گەورە لەگەڵیشیدا زەلیلی دەنێرێت.

لە فەرموودەیەکی صەحیحی دیکەدا کە (عبدالله ی کوری عومەر) رەزای خوایان لێ بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**إذا تبايعتم بالعينة وأخذتم أذناب البقر ورضيتم بالزرع وتركتم الجهاد سلط الله عليكم ذلا لا ينزعه حتى ترجعوا إلى دينكم**)).[٦٤] واتە: هەرکات کڕین و فرۆشتن تان بە فێڵ و فەرەج بوو، دەست تان گرت بە کلکی گاکانەوە، وە رازی بوون بە کشتوکاڵ و زەراعەت، واتە (بە جووت و کشتوکاڵ و مەزارەوە سەرقاڵ بوون) و، وازتان لە جیهاد هێنا، خوای گەورە ڕسواتان دەکات، ڕسواییەك کە قەت لێی دەرناچن و ڕزگار نابن، هەتا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە بۆلای دینەکەتان.

---

[٦٢]) ئیمامی (ترمذي) دەفەرموویت: (( قوله عليه السلام في الشهيد كفي ببارقة السيوف على رأسه فتنة معناه: أنه لو كان في هؤلاء المقتولين نفاق كان إذا التقى الزحفان، وبرقت السيوف فروا لأنه من شأن المنافق: الفرار والروغان عند ذلك. ومن شأن المؤمن: البذل والتسليم لله نفسًا وهيجان حمية الله، والتعصب له، لإعلاء كلمته. فهذا قد أظهر صدق ما في ضميره حيث برز للحرب والقتل، فلماذا يعاد عليه السؤال في القبر؟)).

[٦٣]) صحيح: رواه البخاري في صحيحه، سلسلة الاحاديث الصحيحة للالباني (١٠).

[٦٤]) صحيح: رواه احمد و أبو داود (٣٤٦٢) وصححه الالباني رحمه الله في السلسلة الصحيحة برقم (١١) و صحيح الجامع الصغير (٤٢٣) و صحيح الترغيب والترهيب (١٣٨٩) و غاية المرام (١٦٠) و قال حديث صحيح...

عبدالله ی کوری مەسعود رەزای خوایان لێ بێت دەگێرێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لا تتخذوا الضیعة فترغبوا في الدنیا)).[٦٥] واتە: ڕازی مەبن بە (حیرفە و عەقار) و دونیاتان لا خۆشەویست ببێت.

دەبینین لەم فەرموودە صەحیحانەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەتاع و خۆشی دونیاو، هۆکارەکانی سەرقاڵ بوون، لە کشتوکاڵ، وە بازرگانی بە سودو حیلە (العینة) فرت و فێڵ، بەرهەمی ئاژەڵداری و، پیشەسازی و، پیشە بە (الضیعة) پێکەوە کۆ کردۆتەوە..

سەرقاڵ بوون بەمانە، لە کاتێکدا کە ئیسلام ڕوو بەڕووی شەرو جەنگی یەکلایی کەرەوە دەبێتەوە، دەبێتە حەرام و تاوانی گەورە (مُوبقَة)ی شەرعی، وە جیهاد کردن بە ماڵ (المال) دەبێتە فەرز، ئەگەر موجاهیدەکان پێویستی یان پێی هەبێت، وە فەرزە لەسەر ئافرەتان و، ماڵ و پارەی منداڵەکان، هەتا ئەگەر جیهاد فەرزی (کیفایة)یش بێت، وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمه الله) بریاری لەسەر ئەمە داوە ...[٦٦]

لەبەر ئەوە حەرامە لەسەر خەڵکی شاردنەوە و گرتنەوەی ماڵ و سامان کاتی پێویستی، بەڵکو جارێکیان پرسیارێکیان لە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کرد لەم بارەوە:

((ولو ضاق المال عن إطعام جیاع والجهاد الذي یتضرر بترکه فقال: قدمنا الجهاد وإن مات الجیاع، کما في مسألة الترس وأولی، فإن هناك – الترس – نقتلهم بفعلنا وهنا یموتون بفعل الله)).[٦٧]

واتە: ئەگەر پارەو سامان کەم بوو بۆ دابین کردنی خۆراکی برسییەکان، جیهادیش موسوڵمانان توشی زیان ببن بە ئەنجام نەدان و وازلێ هێنانی، ئەو پارە بۆ کامیان سەرف

---

[٦٥] ) صحیح: رواه الترمذي (٢٣٢٨) و صححه الالباني رحمه الله في السلسلة الصحیحة (١٢) و مشکاة المصباح (٥١٧٨).

[٦٦] ) الفتاوی الکبری لشیخ الاسلام ابن تیمیة رحمه الله (ج٤/ص٦٠٧).

[٦٧] ) الفتاوی الکبری (٤/٦٠٨).

بکرێت؟ فەرمووی: جیهاد پێش برسی یەکان دەخەین، ئەگەر برسی یەکانیش بمرن، وەك لە مەسەلەی (تەتەروس) دا لە پێشترە، ئەگەر لە (تەتەروس)دا بەهۆی ئێمەوە بکوژرێن و بیان کوژین، ئەوە لێرەدا بە فەرمانی خوای گەورە دەمرن.

ئیمام قورطبي (رحمه الله) دەفەرموێت:

((إتفق العلماء على أنه إذا نزلت بالمسلمين حاجة بعد أداء الزكاة فإنه يجب صرف المال إليها)).[٦٨] واتە: هەموو زانایان یەك ران، لەسەر ئەوەی ئەگەر پێویستی و ئیحتیاجی یەك هاتە پێش بۆ موسوڵمانان، پاش پێدان و دەرکردنی زەکاتیماڵیان، ئەوە پێویستە ئەو پارەو ماڵەی کە بەدەست یانەوە ماوەتەوە سەرفی بکەن و بیبەخشن.

هەروەها ئیمام مالك (رحمه الله) دەفەرموێت:

((يجب على الناس فداء أسراهم وإن استغرق ذلك أموالهم. وهذا إجماع أيضا)).[٦٩] واتە: واجبە لەسەر خەڵکی کە بەند کراوەکانیان بە فیدیە ئازاد بکەن، ئەگەر بەهۆیەوە هەموو ماڵ و سامانیشیان خەرج بکەن، ئەمەش بە هەمان جۆر (ئیجماع) و کۆرایە.

جا با دەوڵەمەند و سەرمایە دارەکان لە حوکمی خوای گەورە بەسەر ماڵ و سامانیانەوە ئاگاداربن، کە ئێستا جیهاد پێویستی بە زۆرترین یارمەتی هەیە، وە دین و دنیای موسوڵمانان لە ڕووبەڕوی لەناو چون دایە، وە دەوڵەمەندەکانیش نغرۆی هەواو هەوەس و شەهەواتی خۆیان بوون، ئەگەر دەوڵەمەندەکان یەك ڕۆژ بەڕۆژوو ببونایە لە خۆشی و شەهەواتی خۆیان، وە دەست یان بگرتایەتەوە لە ئیسراف و بەهەدەر دانی ماڵ و پارەیان لە شتە ناپێویستی و ڕەفاهی یەت و هاوشێوەیان، و بیان ناردایە بۆ موجاهیدەکان لە ئەفغانستان (یان هەرکام لە جەبهەکانی دیکەی جیهاد)، ئەوانەی کەوا لە سەرمادا دەمرن و، قاچیان دەبڕدرێتەوە لەناو بەفردا، وە نان و خۆراکی ڕۆژانەیان دەست

---

[٦٨]) القرطبي (٢/٢٤٢).

[٦٩]) القرطبي (٢/٢٤٢).

ناکەوێت، ئەوەندەیان پێویستی لەبەردەستدا نییە هەتا خۆیانی پێ بپارێزن و برینی پێ بپێچن ...

ئەڵێم: ئەگەر دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکان، خەرجی و مەصروف یەك ڕۆژیان خەرج بکەن بۆ موجاهیدەکانی ئەفغان، ئەوە بە ئیزنی خوای گەورە بەو پارەیە گۆڕانکاری یەکی زۆر گەورە لە جیهادی موجاهیدەکان بەرەو سەرکەوتن دروست دەبێت...

زانایانی گەورەو، لەسەرو هەمووشیانەوە فەزیڵەی شێخ (عبدالعزیز بن باز) فەتوای داوە کە دەرکردن و پێدانی زەکات بۆ موجاهیدەکانی ئەفغان لە گەورەترین (قوربات) نزیك کەرەوەکانە لە خوای گەورە و، چاکترین خێرو صەدەقەشە...

## الخلاصة

بە کورتی و پوختی:

١) جیهاد کردن بە گیان و نەفس فەرزی عەینە لەسەر تەواوی موسوڵمانانی ڕووی زەوی ...

٢) ئیزن و ڕوخسەتی هیچ کەسێك بەسەر کەسێکی دیکەوە نییە لە جیهاددا، وە ئیزنی دایك و باوك نییە بەسەر کوڕیانەوە ....

٣) جیهاد بە ماڵ فەرزی عەینە، وە گرتنەوە و نەدانی ماڵ و پارە حەرامە، مادام جیهاد پێویستی بە ماڵ و سامانی موسوڵمانان هەیە ...

٤) وازهێنان و تەرکی جیهاد، وەك وازهێنان و تەرکی نوێژو ڕۆژوو وایە، بەڵکو تەرك کردنی جیهاد لەم ڕۆژانەدا زۆر خراپترە لە تەرکی نوێژو ڕۆژوو، وە ئیبن (روشد) نەقڵی ئیتفاق و کۆڕای کردووە لەسەر ئەوەی ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی عەین، ئەوە فەرزی یەتی جیهاد زۆر بە هێز ترە لە چون بۆ حەجی فەرز ...

## أسئلة كثيرة ومهمة

# پرسیارگەلێکی زۆر و گرنگ

**ئایا دەتوانین ئەمڕۆ ئەم فەتوایە جێبەجێ بکەین؟**

دوای هەموو ئەمانە پرسیارکەرێك دێت و دەپرسێت: ئەوە زانیمان کە ئەمڕۆ جیهاد بە گیان و نەفس فەرزی عەینە، وە جیهاد وەك نوێژو ڕۆژوو فەرزە، بەڵکو جیهاد بە گیان پێشترە لە نوێژو ڕۆژوو، وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ((فالعدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه)).[٧٠] واتە: ئەو دوژمنە فاسیدو دەست درێژ کارە (صائیل)ەی کە دین و دونیا فاسید دەکات هیچ شتێك واجب ترنییە لە دوای ئیمان لە ڕووبە ڕوو بوونەوەی و دوور خستنەوەی و شەڕو کوشتار کردن دژی.

نوێژ دوا دەخرێت و کۆدەکرێتەوە (جەمع)، یان رکاتەکانی کورت دەکرێتەوە، یان شێوازەکەی دەگۆڕدرێت لەبەر بوونی جیهاد، وە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **((ملأ الله بيوتهم وقبورهم نارا كما شغلونا عن الصلاة الوسطى حتى غابت الشمس))**. واتە: خوای گەورە ماڵ و گۆڕیان ئاگراوی بکات، یان خوا ئاگر باتە ماڵ و قەبریان، وەك چۆن ئێمەیان لە نوێژی عەسر سەرقاڵ کرد هەتا خۆر ئاوا بوو، واتە هەتا کاتەکەی ڕۆشت.

موجاهید بۆی هەیە لە ڕەمەزاندا ڕۆژووەکەی بشکێنێ و ئیفطار بکاتەوە، وەك ئیمام موسلیم ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((إنكم مصبحوا عدوكم والفطر أقوى لكم فأفطروا))**. واتە: ئێوە ڕووبەڕووی دوژمنتان دەبنەوە، بەڕۆژوو نەبونیش بۆ هێزتان چاکترە، کەوایە بەڕۆژوو مەبن و، ڕۆژووەکەتان بشکێنن.

---

[٧٠] ) الفتاوى الكبرى (٤/٦٠٨).

بۆمان ڕوون بویەوە کە پرس و روخسەت لە هیچ کەس وەرناگیردرێت بۆ جێبەجێ کردنی فەریزەی جیهاد، ئەگەر بوویە فەرزی عەین (وەك ئێستا فەرزی عەینە) هەر وەك ئەوەی کە پرس و روخسەت لە دایك و باوك و شێخ و گەورە وەرناگیردرێت بۆ جێبەجێ کردن و ئەنجام دانی نوێژی فەرزی بەیانی پێش دەرکەوتن و تلوعی خۆر، وە هەر بەهەمان جۆر پرس و روخسەت لە هیچ کەس ناخوازرێت بۆ ئەنجام دانی فەریزەی جیهاد، ئەگەر باوکێك نوستو کوڕەکەی لەگەڵدا بوو لە شوێنێکدا، وە ئەگەر کوڕەکەی ویستی نوێژی بەیانی بکات و باوکی نوستبوو، ئایا هیچ کەسێك هەیە بڵێت واجبە کوڕەکە پرس لە باوکی بخوازێت بۆ ئەنجام دانی نوێژی فەرزی بەیانی؟ وە گریمان، یان فەرەزەن وای دابنێین کە باوکەکە ڕێگری کوڕەکەی دەکات لە بەجێ گەیاندنی نوێژ، لەبەر هەر هۆکارێك بێت باوکەکە نەیەڵێت و ڕێگری بکات، هەتا ئەوانەی نوستون و نوێژی بەیانی ناکەن ئیزعاج و بێزار نەبن، یان باوکی نایەوێت کوڕەکەی نوێژ بکات ...

**ئایا کوڕەکە گوێڕایەڵی باوکی دەکات؟**

وەڵامەکە ئاشکرایە، ((**إنما الطاعة في المعروف**)).[71] واتە: گوێڕایەڵی تەنها لە چاکە و مەعروفدا دەکرێت. ((**لا طاعة لمخلوق أو لبشر أو لأحد في معصية الخالق**)).[72] واتە: گوێڕایەڵی هیچ کەس یا ن هیچ دروست کراوێك ناکرێت لە بێ ئەمری و تاوانی خوای گەورەدا. یان ((**لا طاعة لمن لم يطع الله**)).[73] واتە گوێڕایەڵی بۆ ئەو کەسە نییە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە نییە. وازهێنان و تەرکی جیهاد تاوان و مەعصییەتی خوای گەورەیە، گوێڕایەڵی و ئیتاعەی هیچ کەسێکیش ناکرێت لە تاوان و مەعصییەتی خوای گەورەدا ...

---

[71]) متفق عليه: رواه البخاري ومسلم، صحيح الجامع (٢٣٢٣).

[72]) صحيح: رواه احمد والحاكم بسند صحيح، وصححه الالباني رحمه الله في مشكاة المصباح (٣٦٩٦) وقال حديث صحيح .

[73]) صحيح: رواه احمد ، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الجامع الصغير (٣٩٦٧) و (٧٣٧٩).

## الإستئذان:

# پرس و روخسەتخواستن

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو بەرچاو ڕوونی لەم باسەدا بە تەوفیقی خوای گەورە دەڵێین:

هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرس و ڕوخسەتیان لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پاش نەفیرو گرتنی رایە نەخواستووە ... بەڵکو پرس و روخسەت خواستن لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرس و ڕاوێژ بووە پاش دامەزراندنی نییەت، یان دوای تۆمار کردنی ناوی هاوەڵەکە لە جەنگەکەدا، وەك لە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا کە ئیمام (ئەحمەد) و (نەسائی) لە موعاویەی کوری جاهمەی السلمی دەگێڕنەوە کە: جاهمە هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتوم بۆ جیهاد و ئەمەوێت ڕاوێژ یان ئیستشارەو پێ بکەم، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: ((هل لك من أم؟) واتە دایکت هەیە، یان دایکت ماوە؟ وتی: بەڵێ، پێی فەرموو: (**(إلزمها فإن الجنة عند رجليها)**). واتە بچۆ بیپارێزە و دەست پێوەی بێت، چونکە بەهەشت لای پێکانییەتی ...[٧٤] لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە دەپرسێت من ناوم لە فلان غەزوە تۆمار کردووە هەتا لەگەڵیان بچم بۆ جیهاد.... ئەمە ئەگەر جیهاد فەرزی (کیفایە)ت بێت. بەلام ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی عەین، پاش نەفیرو راپەرین (الاستنفار)، ئەوە پرس و ڕوخسەت خواستن لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەبێتە نیشانەی نیفاق و دووڕوویی، بەو بەڵگەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَـٰهِدُوا۟

---

[٧٤] ) حسن صحيح: رواه امام احمد والبيهقي والنسائي، وحسنه الالباني رحمه الله في صحيح الترغيب والترهيب برقم (٢٤٨٥) وقال حديث حسن صحيح، ورواه ابن ماجة والطبري بسند صحيح، واللفظ للنسائي.

بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴾ (التوبة: ٤٤–٤٥).

واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) دڵنیابە ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، هیچ کات نایەن داوای مۆڵەت لێ بکەن بۆ دانیشتن و نەچوونە بەرەکانی جەنگ و جیهاد، بەڵکو ئەوانە هەمووکات چاوەڕوانی فەرمانی تۆن، کە فەرمانیان پێ بدەیت کەبە سامان و گیانیان جیهاد بکەن، چونکە ئەزانن کە خوای گەورە چ پاداشتێکی بۆ موجاهیدان دیاری کردووە، وە خوای گەورەش زۆر زانایە بە حاڵی خۆپارێزو موتەقییەکان، بەڵکو هەمیشە هەر ئەوانە داوای مۆڵەتت لێ دەکەن –نەچنە جیهاد–کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نییە، وە لە ڕاستی دینی ئیسلامیش دوو دڵن، بەردەوامیش لە دوو دڵی خۆیاندا سەرگەردانن و دەتلێنەوە...[75] واتە موونافیقەکان.

بەڵام خولەفای ڕاشیدون – ئەبو بەکرو عومەر و عوسمان و علی– ڕەزای خوایان لێبێت وا نازانم هیچ کام لە هاوەڵەکان یان شوێن کەوتەی هاوەڵەکان (تابعین) داوای پرس و روخسەتیان لێ کردبن، هەموو یەکێك ئەگەر ویستبای بچێت بۆ غەزا و جیهاد نەچووە پرس و ئیزن لە ئیمام ئەبو بەکر وەربگرێت، بەڵکو گرنگ ئەوە بووە کە رایە شەکاوە بێت و سریە دەربچێت، پێشەواو ئەمیری باوەڕداران دوای خولەفای راشدین وانازانم ئەوانیش هەرکەس نییەت و ئیرادەی ریباط و جیهادی هەبوبێت پرس و ئیزنی لێ خواستبێ، وانازانم هیچ کەسێك لە تەواوی مێژووی ئیسلامی دا، سزا درابێت لەلایەن پێشەواو ئەمیری باوەر دارانەوە لەبەر جیهاد و غەزا کردن بەبێ پرس و ئیزنی ئەمیر، بەڵکو پرس و ئیزن لە پیشەواو ئەمیری جەنگ (حەرب) و قائیدی شەرەکە دەخوازرێت، لە شەڕ و هێرشبردندا لە

---

[75]) ئەم ئایەتەی سورەتی تەوبە لەسەر ئەو مونافیقانە دابەزی کە لە غەزای تەبوك دواکەوتن و خۆیان دزییەوە

پێناوی تەنزیم کردن و ڕێك خستندا، هەتا بەندە ئەو خوتەو بەرنامە خراپ نەکات کە موسولمانان دایان ڕشتووە بەهۆی هێرش بردنی ئەمەوە...

هەندێك لە فوقەهاو زانایانی ئیسلامی وەك ئیمام ئەوزاعی پرس و ئیزنی ئیمام یان تایبەت کردووە بە کاتی وەرگرتنی کرێ ڕەواتبیان لە دیوانی سەربازەکان ...

ئیمام (الرملی) لە (نهایە المحتاج) دا فەرموویەتی:[٧٦] یکره الغزو بغیر إذن الإمام أو نائبه، ولا کراهة في حالات:

١) إذا فوت الإستئذان المقصود.

٢) أو عطل الإمام الغزو.

٣) أو غلب على ظنه عدم الإذن كما بحث ذلك البلقيني.

واتە: غەزا کردن بەبێ ئیزن و ڕوخسەتی ئیمام یان نوێنەرەکەی کەراهەتی هەیە، وە لەم کاتانەشدا کەراهەتی نییە و دروستە:

١) ئەگەر پرس و ئیزنی مەبەست لێکراو هەڵگیرا .

٢) یان ئەگەر ئیمام غەزای لەکار خست .

٣) یان ئەگەر کەسی جەنگاوەر بەسەر گومانی خۆیدا زاڵ بوو، بە ئیزن نەخواستن وەك ئیمام بەلقینی باسی لەمە کردووە.

**دەگەڕێینەوە و دەڵێین:**

ئەم مەرجانە هەمووی بۆ کاتێکە ئەگەر جیهاد فەرزی (کیفایە)ت بوو، بەلأم ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی (عەین)، ئەوە نەئیزن هەیە و نە ڕوخسەت وەرگرتن لە ئیمام ...

ئیمام (ئیبن ڕوشد) فەرموویەتی:

((طاعة الإمام لازمة وإن كان غير عدل ما لم يأمر بمعصية، ومن المعصية النهي عن الجهاد المتعين)).[٧٧] واتە: گوێڕایەڵی و ئیتاعەی ئیمام واجبە، هەرچەند ئەگەر داد پەروەر

---

[٧٦] (٨/٦٠)

(عادل)یش نەبێت، مادەم فەرمانی نەکردبێت بە تاوان، وە لەو شتانەش کە تاوانە ڕێگری و نەهی کردنی ئیمامە لە جیهادی فەرزی عەین.

زیاتر درێژە بە باسەکە دەدەین و دەڵێین: ئیزن و روخسەت خواردن لە کاتێکدایە کە جەنگ و جیهاد فەرزی (کیفایە) بێت، پاش کیفایە و بوونی بڕی پێویستی موجاهیدەکان بێت بۆ جیهاد کردن و بەجێ گەیاندنی فەریزەی سەرشانیان، بەڵام پێش بوون و ئامادە بوونی ڕێژەی پێویست و کیفایەت، ئەوە بانگەواز داواکاری بۆ چوونە جیهاد هەمووان دەگرێتەوە، واجبە لەسەر هەمووان، بە هەستان و ئەنجام دانی هەندێکیش حوکمی واجبەکە لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێت و هەڵدەگیردرێت، وە هیچ جیاوازی و فەرقیش نییە لە نێوان فەرزی (کیفایە) و (فەرزی عەین) پێش تەواو کردنی ڕێژەی پێویست و کیفایەت.

پێش کیفایەت و پێویست: ئیزن و روخسەت وەرگرتن نییە، وە ئیزن و روخسەت خواستن پاش زانین ئەبێت بە بوونی ڕێژەی پێویست و کیفایەتی موجاهیدان بۆ جیهاد کردن، لە ساحەکانی شەرو کوشتاردا بۆ هەستان بە جێگەیاندنی فەرزەکە .

دوای هەموو ئەمانە پرسیار کەرێك دێت و دەپرسێت: ئێستا یەقین مان هەیە کە جیهاد فەرزی عەینە، وە ئیزن و روخسەتی هیچ کەسێك نییە بۆ چونە جیهاد، بەڵام لێرەدا هەندێك پرسیاری گرنك هەیە:

١) ئایا بەراستی دەکرێت لەم ڕۆژگارەدا موسوڵمانان بەیەك جار نەفیر بکەن و ڕوو بە ڕووی دوژمنان و داگیر کەران بوەستنەوە؟

٢) ئایا دەکرێت بە گیان و ماڵ جەنگ و جیهاد بکەین و پێشەوا (قائید)ێکیش مان نەبێت؟

٣) ئایا دەکرێت لە ئەفغانستان و (عێراق و فەلەستین و غەیری ئەوانیش) جەنگ و جیهاد بکەین لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوا و قادەکان جیاواز و پەرتەوازەن؟

[٧٧]) أنظر فتح العلي المالك للشيخ عليش (١/٣٩٠).

٤) ئایا موسوڵمان بە تەنها دەجەنگێت ئەگەر خەڵکی دانیشتن و پشتیان لە جەنگ و جیهاد کرد ؟

٥) ئایا ئەگەر ئێمە لاواز بووین دروستە بە ناچاری پەنا بەرینە بەر کوفار و بێ باوەران و (ئیستیعانە) یان پێ بکەین ؟

٦) ئایا شان بە شانی ئەو موسوڵمانانە جەنگ و جیهاد بکەین کە ئەزمونێکی خوازراو یان نییە لە پەروەردەدا ؟

## پرسیاری یەکەم:
## ئایا چۆن لەم ڕۆژانەدا ڕاپەرین و نەفیری گشتی جێبەجێ بکەین؟

هەندێك لە خەڵکی وای دەبینن، کە ئەوەی ئیسلام داوای دەکات لە نەفیرو ڕاپەرینی گشتیدا، بەو جۆرەی کوڕ بەبێ ئیزن و ڕوخسەتی دایك و باوکی و، ژن بێ پرس و ڕوخسەتی هاوسەرەکەی دەچن بۆ جیهاد، ئەمە شتێکی قورس و نارەحەتە لەبەر چەند هۆکارێك:

١) هەر پارچەو خاکێکی موسوڵمانان بەشی یەك لەسەر دەی موسوڵمانان ناکات.

٢) ئەمە دەبێتە هۆکاری لەکار خستنی پرۆسەی پەروەردە و تەربیەی ئیسلامی، کە بە هیواو ئەمەلی ڕزگار کردنی ئەم ئوممەتە دادەنرێت بە ئیزنی خوای گەورە ...

٣) هەروەها دەرچوون و ڕاپەرینی گشتی موسوڵمانان بۆ جەنگ و جیهاد، دەبێتە هۆکاری بەتاڵ بوون و چۆڵ کردنی خاکی ئیسلامی، ئەگەر هەموو کەسێك بچێت بۆ جیهاد لە فەڵەستین و ئەفغانستان و (بەرەکانی دیکەی جەنگ و جیهاد) ئەوە خاك و ئەزری موسوڵمانان چۆڵ دەبێت بۆ شیوعی و بەعسی و نەتەوە پەرستی یەکان و عیلمانییەکان.

**وەڵام:**

ئەگەر موسوڵمانان فەرمانی خوای گەورەیان جێبەجێ بکردایە، وە هەستانایە بە ڕاپەراندنی شەریعەتەکەیان، لە دەرچوون و ڕاپەرین (نەفیر)ی گشتیدا بۆ یەك هەفتە لە

پێناو ڕزگار کردنی خاکی فەڵەستیندا، ئەوە (بە ئیزنی خوا) تەواوی خاکی فەڵەستین پاك دەبوویەوە بە تەواوەتی لە یەهود، وە هەروەها لە ئەفغانستانیش، وە لەونە زیاتری پێ نەدەچوو، ئەگەر هەموو ئوممەت دەربچوایە، وە ئیتر شوێن و جێگەی بانگ خوازان چۆڵ نەدەبوو بە دەرچوونی ئافرەتانیان.

## پرسیاری دووەم:
## ئایا دەکرێت جیهاد بکەین و ئەمیرێك مان نەبێت ؟

بەڵێ جیهاد دەکەین ئەگەر ئەمیریش مان نەبێت، وە هیچ کەسێك شتی وای نەوتووە کە فەرزی جیهاد لادەچێت بە نایەك ریزی موسوڵمانان لەسەر یەك ئەمیر، بەڵکو ڕۆژانی جەنگی موسوڵمانان و صەلیبیەت مان بینی، کە تەتەرەکان شەریان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمیرەکانیان جیاواز بوون، لە هەموو وڵاتێك ئەمیرو چەند فەرمان بەدەستێك هەبوون، لە حەلەب ئەمیرێك، لە دیمەشق ئەمیرێك، لە میصر زیاتر لە چەند ئەمیرێك، وە هەندێك یان پەنایان دەبردە بەر صەلیبی یەکان بەسەر برا کار بەدەستەکانیاندا، وەك لە شاری (شاور) رویدا، کە پەنایان بردە بەر صەلیبی یەکان بەسەر ئەمیرێکی تردا، لە میصر (ضرغام)....

هیچ کام لە زانایان نەیان وتوە کە ئەم حاڵ و بارە، ئەم زۆری یە- فەریزەی جیهاد لادەبات، لە بەرگری کردن لە خاکو زەوی موسوڵمانان، بەڵکو واجبی سەرشانیان زیاترو چەند بەرامبەر دەبێت، وە هەروەها بەهەمان جۆر لە ئەندەلوس، هەروابوو، وەك شاعر دەڵێت:

وتفرقوا شيعا فكل محلة فيها أمير المؤمنين ومنبر

شاعیرێکی تر دەڵێت:

مما يزهدني في أرض أندلس ألقاب معتمد فيها ومعتضد

ألقاب مملكة في غير موضعها كالهر يحكي انتفاخا صولة الأسد

هیچ کام لە زانایان نەی وتـوە کـە جیهـاد لـەم کـات و حالـەدا ناکرێت، بـەڵکو گـەورەو سادەکانی زانایان لە ڕیزی پێشەوەی شەرەکانی ئەندەلوس بوون.

ڕەنگە هەندێك جار شەرو جەنگ بەبێ ئامادەیی پێشەوا یـان قائیـدی شـەرعی بکرێـت، بەڵام خودی شەرەکە نوێنـەرێکی تێدایـە لەلایـەن پێشەوای گشتی موسـوڵمانانەوە، وەك چۆن ڕۆژی جەنگی (موئتە) رویـدا، خالیـدی کـوری وەلیـد رەزای خـوای لـێ بێـت هەسـتاو رایەکـەی هـەڵگرد، وە بەهۆیـەوە خـوای گـەورە سـوپای موسـوڵمانانی رزگـار کـرد، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پـشتیوانی کارەکـەی کـردو بەچـاکی هەڵـسەنگاندو سەنای دا...

رەنگە هەندێك جار ئیمام یان پێشەواو ئـەمیری بـاوەرداران ئامـادە نـەبێت، خـۆ ئـەوە فەرزیەتی قیتال و کوشتار و بەرگری کردن لـە خـاك و زەوی موسـوڵمانان هـەڵناگرێت، وە چاوەڕێ ناکەین هـەتا ویلایـەتێکی گـەورە دروسـت ببێـت و خەلافـەت دابمـەزرێت، چـونکە ویلایەتی گشتی و خەلافەت بە تیـۆرو بـیردۆزی سـەقاف و دیراسـی دروسـت نابێـت، بـەڵکو جیهاد سەلامەت ترین ڕێگەیە بۆئەوەی ویلایـەتی تایبـەت –واتـە ئیمـارەی شـەرو قیتـال– ببێتە ویلایەتی گشتی و خەلافەت، وە موجاهیـدان و تێکۆشـەران لـەناو خۆیانـدا بۆخۆیـان ئـەمیرێك هەڵدەبـژێرن بـۆ جیهـاد هـەتا کارەکانیـان بـۆ جێبـەجێ و ئیـصلاح بکـات، هـەتا پەرتەوازەی و تەفرەقەیان یەك بخات، وە هەتا هێزیـان لـە لاوازییـەوە بـۆ بگێڕێتـەوە، لـە فەرموودەیەکی صەحیحدا کە عوقبەی کوری عامر کە لە هۆزی خۆیـان بـوو، دەگێڕێتـەوە: ((بعث رسول الله صلى الله عليه وسلم سرية فسلحت رجلا سيفا قال، فلما رجع قـال: مـا رأيـت مثل ما لامنا رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: أعجزتم إذ بعثـت رجـلا فلـم يمـض لأمـري أن تجلعوا مكانه من يمضي لأمري)).واتە: جارێکیان پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) سوپایەکی نارد و پیاوێکی کردە ئەمیریان و چەکی پێدا، دەڵێت: کاتێك گەرانـەوە، وتـی قەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەو جۆرە لۆمـەی نـەکردین، فـەرمووی: ئـەوە ئەونەتان دەسەڵات نەبوو ئەگەر پیاوێکم کردە ئـەمیرتان فـەرمانی منـی جێبـەجێ نـەکرد،

کەسێکی تر بکەنە جێگەی هەتا بە چاکی فەرمانەکانی من جێبەجێ بکات.[٧٨] ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هانی دەدان لەسەر گۆرینی پێشەواو ئەمیری سوپایەك، کە بەدەستی پیرۆزی خۆی رایەکەی پێدابوو، ئەی چی بەوەی ئەگەر لە بنەرەتدا موسوڵمانان ئەمیرو پێشەوایەکیان هەر نەبوو، کەواتە ئەم کاتە زۆر پێویست ترە بۆ دانانی پێشەوای جەنگ.

ئیبن قودامەی مەقدسی رەحمەتی خوای لێ بێت لە کیتابی (المغنی) دا دەفەرموێت: ((فإن عدم الإمام لم يؤخر الجهاد لأن مصلحته تفوت بتأخيره)).[٧٩] واتە: ((ئەگەر پێشەوا و سەرکردە نەبوو ئەوە جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا دوا ناخرێت، چونکە بەرژەوەندای جیهاد بە دواخستنی لەناو دەچێت و نامێنێت)).

ئەگەر خەڵکی هەموو پێشەوایەك یان هەڵبژارد واجبە ئەوانی دیکەش گوێڕایەلی بکەن، لە کتابی (فتح العلی المالك) دا هاتووە: ((نقل الشيخ ميارة إذا خلا الوقت من الأمير وأجمع الناس رأيهم على بعض كبراء الوقت يمهد سبيلهم ويرد قويهم عن ضعيفهم فقام بذلك قدر الجهد والطاقة. فالظاهر أن القيام عليه لا يجوز، والمعرض له يريد شق عصا الإسلام وتفريق جماعته، ففي صحيح مسلم الحديث: ((إنها ستكون هنات وهنات فمن أراد أن يفرق أمر هذه الأمة وهو جميع فاقتلوه كائنا من كان)) من أتاكم وأمركم جميع على رجل واحد يريد تفريق جماعتكم فاقتلوه)).[٨٠] واتە: شێخ میارە نەقڵی کردووە ئەگەر کاتێك هاتوو ئەمیر نەبوو، وە خەڵکیش هەموویان پێکەوە پێك هاتن لەسەر ئەوەی هەندێك لە گەورەکانی ئەو کاتە، کە رێگەیان بۆ رون بکەنەوە و هێزو مافیان لە دەسەلأت داراکان بۆ وەر بگرنەوە، وە بۆ ئەمەش بە پێی هێزو توانایان هەستن بە ئەنجام دانی و کەم تەرخەم نەبن، ئەوەی ئاشکرایە وەستانەوە ڕوو بەم ئەمیرانە دروست نییە، وە ئەو کەسەشی بەمە رازی نییەو

---

[٧٨] ) أبو داود وأحمد وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، أنظر الفتح الرباني (٤١/٤٥).

[٧٩] ) ٨/٢٥٣(

[٨٠] ) ١/٣٨٩(

دەیەوێت یەك ریزی موسوڵمانان تێك بدات و پەرتەوازەی بكات، لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: ((ئەگەر كەسێك هات بۆ ناوتان، وە هەمووتان لەسەر پیاوێك كۆببونەوە و پێك هاتبوون، ئەگەر ئەو كەسە ویستی دوو بەرەكی و ەرتەوازەیی بكاتە ناو كۆمەڵەكەتانەوە ئەوە بیكوژن)).

## پرسیاری سێیەم:

## ئایا دەكرێت لە ئەفغانستان جەنگ و جیهاد بكەین لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوا و قادەكان جیاواز و پەرتەوازەن؟

وەلاّم: شەرو قیتال واجبە لە ئەفغانستان، لەگەڵ ئەوەشدا پێشەواو قادەكان جیاوازو پەرتەوازەن، چونكە شەرو قیتال بەرگری یە لە خاكی موسوڵمانانی دەست درێژ كراو لەسەریان لەلایەن مولحیدەكانەوە، وە هیچ رێگرێگ نییە لە شەڕكردن شان بەشانی دەستە و مەجموعە ئیسلامییەكان، دژی بێ باوەرە مولحیدەكان، وە هەموو پێشەوای حیزب و دەستەیەك بە پێشەواو ئەمیری شەر كردن دەزانرێت بۆ ئەو حیزبە .

## پرسیاری چوارەم:

## ئایا موسوڵمان بە تەنها دەجەنگێت ئەگەر خەڵكی دانیشتن و پشتیان لە جەنگ و جیهاد كرد ؟

وەلاّم: بەڵێ دەجەنگێت، چونكە خوای گەورە (عزوجل) بانگەوازی پێغەمبەرەكەی دەكات و دەفەرموێت:

﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴾ (النساء٨٤). واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) شەڕو كوشتار بكە لە پێناوی خوای گەورە و رزگار كردنی لاوازەكاندا دژی بێ

باوەران و موشریکان و ئەوانەی پشت لەم دینە دەکەن و دژایەتی دەکەن، ئەگەر بەتەنها خۆشت بیت، تۆ هەر لەئەرك و هیدایەتی خۆت بەرپرسیت، وە هان و تەشویقی باوەر دارەکانیش بدە بۆ شەرو کوشتار دژی خوانەناسان، بێ گومان خوای گەورە بەهۆی ئەو جیهادەوە لە زەبرو زۆرو خراپەو شەری ئەو بێ باوەرانە دەتپارێزێ، وە هێزو هەڵمەتی خوا لەوان سەختترە لە جەنگدا، وە لە سزاو تۆڵەشیدا توندترو تیژترە.[٨١]

ئایەتەکە فەرمان بە پێغەمبەری خوا دەکات (صلى الله عليه وسلم) بە دووشتی واجب، چونکە فەرمانەکە بۆ وجوبە:

١) شەڕو کوشتار ئەگەر بەتەنها خۆشی بێت.

٢) وە هاندان و تەحریضی باوەر داران لەسەر شەر کردن.

خوای گەورە باس لە حیکمەتی شەر کردن دەکات، ئەویش بریتیە لە دورخستنەوە و لابردنی شەرو زەرەرو زەبری بێ باوەران، چونکە بێ باوەران هەرگیز لێمان ناترسن ئەگەر شەرو کوشتاریان نەکەین، واتە تەنها بەشەر و کوشتار کردنیان لێمان دەترسن،

---

[٨١] {فقاتل في سبيل الله} يعني بقوله جل ثناؤه: {فقاتل في سبيل الله لا تكلف إلا نفسك} فجاهد يا محمد أعداء الله من أهل الشرك به في سبيل الله، يعني: في دينه الذي شرعه لك، وهو الإسلام، وقاتلهم فيه بنفسك. فأما قوله: {لا تكلف إلا نفسك} فإنه يعني: لا يكلفك الله فيما فرض عليك من جهاد عدوه وعدوك، إلا ما حملك من ذلك دون ما حمل غيرك منه: أي إنك إنما تتبع بما اكتسبته دون ما اكتسبه غيرك، وإنما عليك ما كلفته دون ما كلفه غيرك. ثم قال له: {وحرض المؤمنين} يعني: وحضهم على قتال من أمرتك بقتالهم معك. {عسى الله أن يكف بأس الذين كفروا} يقول: لعل الله أن يكف قتال من كفر بالله وجحد وحدانيته، وأنكر رسالتك عنك وعنهم ونكايتهم.وقد بينا فيما مضى أن "عسى " من الله واجبة بما أغنى عن إعادته في هذا الموضع. {والله أشد بأسا وأشد تنكيلا} يقول: والله أشد نكاية في عدوه من أهل الكفر به منهم فيك يا محمد وفي أصحابك، فلا تنكلن عن قتالهم، فإني راصدهم بالبأس والنكاية والتنكيل والعقوبة، لأوهن كيدهم وأضعف بأسهم وأعلي الحق عليهم. والتنكيل مصدر من قول القائل: نكلت بفلان، فأنا أنكل به تنكيلا: إذا أوجعته عقوبة. كما:٧٩٢٠ – حدثنا بشر بن معاذ، قال: ثنا يزيد بن زريع، قال: ثنا سعيد، عن قتادة، قوله: {وأشد تنكيلا} أي عقوبة. / جامع البيان عن تأويل آي القرآن – الشهير بتفسير الطبري – للإمام أبو جعفر محمد بن جرير الطبري

﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ ﴾ (الانفال: ٣٩). واتە: بیانکوژن و لەناویان بەرن و شەڕو کوشتار بکەن دژی موشریکەکان، هەتا نەبنە مایەی شیرك و فیتنە، هەتا تەواوی دین (حوکم و شەریعەت) هەر بۆ خوای گەورە دەبێت. مەبەست لێرەدا بە (الفتنة) شیرکە، وەك ئیبن عەباس و سەدی و غەیری ئەوانیش لە هاوەڵان و موفەسرین فەرموویانە...[٨٢]

بە وازهێنان لە شەڕو قیتال ڕەشایی شیرك زۆر دەبێت، ئەوەش فیتنەیە و بێ باوەڕان سەردەکەون، هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ڕواڵەت لە ئایەتەکە تێگەیشتبوون، ئەبی ئیسحاق دەگێڕێتەوە:

((قلت للبراء بن عازب رضي الله عنه: الرجل يحمل على المشركين أهو يلقي بيده إلى التهلكة؟ قال: (لا لأن الله بعث رسوله صلى الله عليه وسلم فقال: ﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ ﴾ إنما ذاك في النفقة).[٨٣] ومعنى (إنما ذلك في النفقة) يشير إلى الآية: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾...)) فترك النفقة هو التهلكة.

((وتم بە بەرائی کوری عازەب (ڕەزای خوای لێبێت) ئایا ئەگەر پیاو بەتەنها خۆی بدات بەسەر موشریکاندا بەشەڕو کوشتار کردن، ئایا ئەوە خۆی تیا بردووە یان خۆی بەهەلاکدا بردووە؟ ووتی : نا، چونکە خوای گەورەی پێغەمبەری ناردووە (صلى الله عليه وسلم) و پێی دەفەرموێت: ﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ ﴾ النساء: ٨٤ ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەلاکەت و خۆتیابردن لە خەرج نەکردن و نەدانی نەفەقەیە، واتای ((إنما ذلك في النفقة)) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ (البقرة: ١٩٥). واتە: لە پێناوی سەرخستنی دینی خوای گەورەدا (بۆ جیهاد کردن) ببەخشن، وە

---

[٨٢] ) القرطبي (٢/٢٥٣).

[٨٣] ) الفتح الرباني (١٤/٨) رواه أحمد وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

نەکەن دەست قونجاوی بکەن و خۆتان بەهیلاکدا بەرن، بە خەرج نەکردنی ماڵ و داراییتان بۆ جەنگ و جیهاد دژی بیّ باوەران)). کەواتە نەبەخشین و خەرج نەکردنی ماڵ بۆ جەنگ و جیهاد بۆخۆی بریتیە لە تەهلوکە و تیاچوون ..

دیارە لێرەدا بەرائی کوری عازەب دەیەوێت ئەو هەڵە تێگەیشتنەی ئەبی ئیسحاق راست بکاتەوە لە هەردوو ئایەتی ((**وقاتل في سبيل الله**...)) و ((وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ ...)) و واتاو مەبەست لە هەلاکەت ....

(ابن العربی) لە (أحكام القران) دا دەفەرموێت:

((وقد تكون حالة يجب فيها نفير الكل إذا تعين الجهاد على الأعيان بغلبة العدو على قطر من الأقطار أو لحلوله بالعقر فيجب على كافة الخلق الجهاد والخروج فإن قصروا عصوا. فإذا كان النفير عاما لغلبة العدو على الحوزة أو استيلائه على الأسارى كان النفير عاما، ووجب الخروج خفافا وثقالا ركبانا ورجالا عبيدا وأحرارا، من كان له أب من غير إذنه، ومن لا أب له حتى يظهر دين الله وتحمي البيضة وتحفظ الحوزة ويخزى العدو ويستنقذ الاسرى ولا خلاف في هذا. فكيف يصنع الواحد إذا قعد الجميع؟ يعمد إلى أسير واحد فيفديه، ويغزو بنفسه إن قدر وإلا جهز غازيا)).[٨٤] واتە: هەندێك جار هەیە کە راپەرین و دەرچوونی تەواوی خەڵکی تێیدا واجب دەبێت، ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی عەین، ئەویش بە سەرکەوتنی دوژمن بەسەر پارچەیەك یان بەشێك لە خاکی موسوڵمانان، یان ئەوەی لە دەوریدایە، لەم کاتەدا واجبە لەسەر تەواوی موسوڵمانان جیهاد کردن و دەرچوون بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی دوژمن، خۆ ئەگەر کەم تەرخەمیش بوون ئەوە تاوان بارن و بێ فەرمانی خوای گەورەیان کردووە، خۆ ئەگەر دەرچوون و راپەڕینەکە گشتی بوو بە سەرکەوتنی دوژمن بەسەر حەوزەی موسوڵماناندا یان دەست بەسەرا گرتنی دیل و بەندکراوەکان، ئەوە دەرچوون بۆ هەمووان واجب دەبێت، وە دەرچوون بۆ لاوازو بەهێزو، ئازاو ترسنۆك و، دەوڵەمەندو هەژار و،

---

[٨٤] (٢/٩٥٤)

بەندە و ئازاد و، ئەسپ سوارو بێ ئەسپ واجب دەبێت، هەرکەس باوکی هەبو بێ ئیزن و روخسەتی باوکی دەروات بۆ جیهاد، وە ئەو کەسەش کە باوکی نییە، هەتا دینی خوای گەورە سەردەکەوێت و، سپیایی موسوڵمانان و حەوزەی ئیسلام دەپارێزرێت، وە دوژمن سەرشۆرو شەرمەزار دەبێت و دەشکێت، و بارمتەو دیلەکانی ژێر دەستی بێ باوەران ئازاد دەکرێن، ئەم حوکمەش هیچ خیلاف و جیاوازییەکی تێدا نییە لە بەینی زانایاندا، باشە پیاو چی بکات ئەگەر تەواوی خەڵکی پشتیان لە جیهاد کردو دانیشتن؟ وەڵام: کار دەکات بۆ ئازاد کردنی گیراوێکی موسوڵمانان کەلای بێ باوەران گیراوە، و فیدیەی بۆ دەدات، وە بۆخۆی ئەگەر توانی بە تەنها جیهاد دەکات و دەجەنگێت، خۆ ئەگەر نەشی توانی ئەوە کەسێکی شەرکەر ئامادە دەکات و یارمەتی دەدات بۆ چوونە جەنگ و جیهاد)).

بەڵکو شەڕو کوشتاری بەندە بۆخۆی بەتەنها دژی بێ باوەران خوای گەورە لێی رازی دەبێت و پێشی سەیر دەبێت، وەك لە فەرموودەیەکی (صەحیح)دا هاتووە کە ئیمام (ئەحمەد) و (ئەبو داود) ریوایەتیان کردووە (عبدالله ی کوری مەسعود) رەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((عجب ربنا من رجل غزا في سبيل الله فانهزم يعني أصحابه فعلم ما عليه فرجع حتى أهريق دمه فيقول الله تعالى لملائكته انظروا إلى عبدي رجع رغبة فيما عندي وشفقة مما عندي حتى أهريق دمه)).**[٨٥] واتە: پەروەردگارمان سەیری پێهات لە پیاوێك کە لە پێناوی خوای گەورەدا تێکۆشاو جەنگا، هاوەڵەکانی تێك شکان و گەرانە دواوە، وەزانی چی بەسەردێت ئەگەر بگەڕێتەوە، بەلام بۆخۆی بەتەنها گەڕایەوە بۆ کوشتاری دوژمنان، هەتا ئەو کاتەی خوێنی رژا، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەم بکەن، گەرایەوە لەبەر رەغبەت و شەفەقەتی من هەتا خوێنی رژا. لە ریوایەتێکی دیکەشدا ئەمە هاتووە کە پێغەمبەری خوا

---

[٨٥] ) صحيح: رواه احمد في مسنده و ابو داود في سنن أبي داود برقم (٢٥٣٦) و صححه الالباني رحمه الله في (مشكاة المصابيح) و (صحيح الجامع الصغير للسيوطي) برقم (٣٩٨١) و (صحيح الترغيب والترهيب للمنذري) و قال حديث صحيح....

(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: ((**عجب ربنا لرجل أو كما قال النبي صلى الله عليه وسلم قاتل الجيش، وعاد وحده، وقاتل حتى قتل**)). واتە: پەروەردگارمان سەیری پێهات، کابرایەك هاوەڵەکانی لە شەڕدا شکان و گەرانەوە بەرەو دواوە، بەڵام ئەم تەنها بۆخۆی گەرایەوە و شەرو کوشتاری سوپاکەی دوژمنی کرد، وە شەری کرد بە تەنها هەتا کوژرا.

## پرسیاری پێنجەم:

## ئایا شان بەشانی ئەو موسوڵمانانە جەنگ و جیهاد بکەین کە ئەزموونێکی خوازراو یان نییە لە بەروەرەدا ؟

ئەم پرسیارە لەلای هەندێك کەسەوە دەکرێت، کە هەندێك لەوکەسانە بە نیازو نییەتێکی دڵسۆزانەوە دەپرسن و دەڵێن: چۆن شەرو قیتال بکەین شان بەشانی گەلێکی وەك ئەفغان کە کەسانی راستگۆو کەسانی درۆزن یان تێدایە، وە کێشانی سیغارو (نسوار) جۆرێکە وەك سیغار، تێیاندا شتێکی ئاشکرایەو، هەندێکیان چەکەکانیان دەفرۆشن؟ ئەوان کەسانێکی دەمارگیرو موتەعەصیبن بۆ (مەذهەبی حەنەفی) و، هەنێکیشیان نوشتەو چاوە زار هەڵدەواسن ...

پێش ئەوەی حوکمە شەرعییەکان ڕوون بکەمەوە دەڵێم: گەلێکم پێ بڵێن لە سەر زەویدا ئەم شتانەی تێدا نەبێت؟

باشە واز لە بێ باوەرەکان بهێنین لە موسوڵمانەکاندا تەنها لەبەر ئەوەی ئەم شتانەی تێدایە؟

**وەڵام**: واجبە شەرو قیتال بکرێت، چونکە شەرو قیتال لەسەر بنەمای (دفع أعظم الضررين) واتە: دوور خستنەوەی گەورەترین زیان بە بچوکترین. چەندەها قاعیدەی فیقهی هەیە لە (مجلة الاحكام العدلية) دا، لەوانە مادەی (٢٦) :

((يتحمل الضرر الخاص لدفع ضرر العام)). واتە: زیانی تایبەت لە جێگەی دوورخستنەوەی زیانی گشتی بەکار دەهێنرێت)).

مادەی ژمارەی (٢٧) : ((الضرر الأشد يزال بالضرر الأخف)). واتە زیانی توندو زۆر بە زیانی کەم لادەبرێت.

مادەی (٢٨): ((إذا تعارضت مفسدتان روعي أعظمهما ضررا بارتكاب أخفهما)). واتە : ئەگەر دوو مەفسەدە کۆبوونەوە، ئەوە سەیر دەکرێت کامیان فەسادی کەمتر بوو ئەوە گەورەکەیانی پێ لادەبرێت.

مادەی (٢٩) : ((يختار أهون الشرين)). واتە: ئەگەر دوو شەر یان خراپە کۆبوونەوە کامیان شەرو خراپەی کەمتر بوو ئەوەیان هەڵدەبژێرین.

دەبێت ئیلا کامەیان شەرو خراپەی کەمتر بوو، ئەوەیان هەڵبژێرین: ئایا کامیان (ئەعظەمو شەرە)؟ واتە کامیان گەورەترین شەرو خراپەیە؟ گرتن و داگیر کردنی ئەفغانستان لەلایەن روسیاوە و، گۆرینی بۆ خاك و بیلادی کوفر، کە رێگری قورئان خوێندن و ئیسلامەتی تێیدایە، یان جیهاد کردن شان بەشانی گەلێك کە تاوان و هەڵەیان تێدایە؟

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (رحمه الله) لە (مجموع الفتاوى) دا دەفەرموێت:

((ولهذا كان من أصول أهل السنة والجماعة الغزو مع كل بر وفاجر، فإن الله يؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر وبأقوام لا خلاق لهم، كما أخبر بذلك النبي صلى الله عليه وسلم، لأنه إذا لم يتفق الغزو إلا مع الأمراء الفجار أو مع عسكر كثير الفجور فإنه لا بد من أحد أمرين: إما ترك الغزو معهم، فيلزم من ذلك استيلاء الآخرين الذين هم أعظم ضررا في الدين والدنيا، وإما الغزو مع الأمير الفاجر فيحصل بذلك دفع الأفجرين وإقامة أكثر شعائر الإسلام، وإن لم يمكن إقامة جميعها، فهذا هو الواجب في هذه الصورة وكل ما أشبهها، بل كثير من الغزو الحاصل مع الخلفاء الراشدين لم يقع إلا على هذا الوجه، وثبت عن النبي صلى الله عليه وسلم: (الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة، الأجر والمغنم)).[٨٦] واتە: وە هەر لەبەر ئەمە لە ئوصول و

[٨٦] (٢٨/٥٠٦)

بنەمای ئەهلی سوننەت و جەماعەتە شەرو تێکۆشان لەگەڵ هەموو پێشەوایەکی چاکەکار و فاجردا، چونکە خوای گەورە پشتیوانی ئەم دینە دەکات بە پیاوێکی فاجر، یان بە قەومێك کە هیچ بەشێکیان نابێت، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە، چونکە ئەگەر جیهاد و غەزا نەکرا، تەنها لەگەڵ کاربەدەستانی فاجر نەبێت، یان لەگەڵ سەربازانێکی زۆر فاجر دا نەبێت، ئەوە لێرەدا تەنها دوو ڕێگە چارە هەیە، یان دوو بریار هەیە: یان ئەوەتا غەزا ناکرێت شان بە شانیان (لەبەر ئەو فجورەی کە هەیانە)، ئەوەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە ئەوانەی زۆر لەمان زیانیان گەورەترە لەسەر دین و دنیا زاڵ ببن، یان ئەوەتا غەزا دەکرێت لەگەڵ پێشەوایەکی فاجردا، بەمەش گەورەترین فجوریان لادەچێت و، زۆرترین دروشم و شەعائیری ئیسلام پیادە دەبێت، ئەگەر هەموویشی پیادە نەکرێت، ئەوە واجبە لە وێنەی ئەوەدا، هەموو شتێکی دیکەی هاوشێوەی، بەڵکو زۆربەی ئەو غەزایانەی ڕویدا لەگەڵ خەلیفەکاندا ڕووی نەدا تەنها لەسەر ئەو شێوە نەبێت، وە لە پێغەمبەری خوداوە (صلی الله علیه وسلم) هاتووە بە صەحیحی کە فەرموویەتی: **(الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة).**[87] واتە ئەسپەکانی جەنگ تا ڕۆژی دوایی خێریان بە ناو چاوانەوەیە)).

مادەم ئەوان موسوڵمانن واجبە شان بەشانیان دژی بێ باوەران شەرو جیهاد بکرێت. رایە لە ئەفغانستان ئیسلامییە، ئامانجەکەش ئاشکرایە، ئەویش دامەزراندنی دینی خوای گەورەیە لە زەویدا، ئەگەر موسوڵمانان لە فەلەستین شەڕیان بکردایە، فەلەستین ئاوای بەسەر نەدەهات، لەگەڵ ئەو خراپانەی کە لەسەرەتادا هەبوون، هەتا پێش ئەوەی بەتەواوەتی شتەکە خراپ و فاسد ببێت، و پێش ئەوەی جورج حەبش و نایف حەواتمە و بوشی باوك و هاوشێوەیان بهاتنایە...

---

[87]) صحيح: رواه مسلم.

بەڵام قـادە و پێشەواکانی جیهـادی ئـەفغانی هـەموویان بـەڕۆژوون و، نوێـژ دەکـەن و، دروشمەکانی ئیسلام پیادە دەکەن و، بانگەواز بۆ ئیسلام دەکەن.

واجبە شەرو قیتال بکرێت شان بە شانی هەر گەلێکی موسوڵمان، مادام موسوڵمان بن، هەرچەند فسق و فجوریشیان هـەبێت و هەرچـی بێـت، مـادەم شـەڕو کوشـتار کردنەکـەیان دژی بێ باوەران یان ئەهلی کیتاب یان مولحیدەکان بێت، ئیمام شەوکانی لە (نیل الأوطـار) دا دەفەرموێت: ((وتجوز الإسـتعانة بالفسـاق علـى الكفـار إجماعـا)).[88] واتـە: دروسـتە پـەنا ببرێتە بەر فاسیقەکان لە دژی کافرەکان بە ئیجماع، واتە بە کۆرای هاوەڵە بەڕێزەکان.

## پرسیاری شەشەم:

## ئایا ئەگەر ئێمە لاواز بووین دروستە بەناچاری پەنا بەرینە بەر بێباوەڕان و (ئیستیعانە) یان پێ بکەین؟[89]

هەندێك کەس بۆ ئەوە چوون کە داوای هاوکـاری لـە (ئـەمریکا) و ولاّتـە ڕۆژ ئاواییـەکان بکرێت بۆ جیهادی ئەفغان، واتە موسوڵمانان پەنایان پێ بەرن و، بـە زاراوە شـەرعییەکەی (ئیسـتیعانە) یان پێ بکرێت، هەروەها پەنا ببرێتە بەر روسیا دژی داگیر کەرانی یەهودی لە فەڵەستین، وە بێ گومان ئەم جۆرە (ئیـستیعانە)یـەش حەرامـە بـە کۆدەنگ و ئیتیفـاقی فوقـەهاکان، دۆڕانـدن و وون کردنـی ئامـانجی جیهـادە بـە تـەواوەتی، لـە باسەکەشـدا فەرموودەی دژ بەیەك (معارض) هەیە ، واتـە هەنـدێك یـان بەڵگەیـە لەسـەر دروسـتی ئـەو کارەو هەندێکی دیکەیان بەڵگەیە لەسەر نادروستی، لەو فەرموودانەش کـە ڕێگـری دەکـات لە (ئیستعانە) بە بێ باوەران ئەمانەن:

---

[88]). ٨/٤٤)

[89]) کە دەڵەین (ئیستعانە) مەبەست مان پێی سوود وەرگرتنی موجاهیدانە لە هاوکاری بێ باوەران.

١) فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە لە (موسلیمدا) : ئەویش کاتێك کابرایەکی موشریك لە جەنگی (بەدر)دا هات بۆ هاوکاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بەلاَم پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: ((**ارجع فلن استعین بمشرك**)). واتە بگەرێوە ئێمە پەنا نابەینە بەر موشریك.[٩٠] پاشان دوای ئەوەی کابراکە ئیمانی هێنا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رێگەی پێدا کە بەژداری بکات لە غەزاکەدا....

٢) فەرموودەیەکی دیکەی صەحیح هاتووە: کە خوبەیبی کوری سەقال خوای لێ رازی بێت دەگێرێتەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**إنا لا نستعین بالمشرکین علی المشرکین**)).[٩١] واتە ئێمە پەنا نابەینە بەر موشریکان بەسەر موشریکاندا.

هەروەها دەقێکی صەحیح هەیە، کە صەفوانی کوری ئومەییە لەگەلْ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شەری کردووە دژ بە موشریکان، لەگەلْ ئەوەشدا بێ باوەر بووە.

ئیمامی نەوەوی رەحمەتی خوای لێ بێت لە (تهذیب الاسماء واللغات)دا دفەرموێت: (صفوان بن أمیة شهد حنینا مع النبي صلی الله علیه وسلم کافرا). واتە: صەفوانی کوری ئومەییە بەژداری جەنگی حونەینی کردووە لەگەلْ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لەگەلْ ئەوەشدا بێ باوەر بووە، واتە بە کافری بەژداری ئەو جەنگەی کردووە.[٩٢]

---

[٩٠]) تەواوی فەرموودەکە بەم جۆرەیە:

عن عائشة رضي الله عنها أن رجلا من المشركين كان معروفا بالجرأة والنجدة أدرك النبي صلى الله عليه وسلم في مسيره إلى بدر في حرة الوبرة فقال جئت لأتبعك وأصيب معك فقال له النبي صلى الله عليه وسلم ((تؤمن بالله ورسوله)) قال لا قال ((ارجع فلن أستعين بمشرك)) قالت ثم مضى حتى إذا كنا في الشجرة أدركه الرجل فقال له كما قال له أول مرة فقال ((تؤمن بالله ورسوله)) قال لا قال ((ارجع فلن أستعين بمشرك)) ثم لحقه في البيداء فقال مثل قوله فقال له ((تؤمن بالله ورسوله)) قال نعم قال فانطلق)).

[٩١]) صحيح: رواه احمد في منسده برقم (١٥٤٤٩) و الحاكم في المستدرك على الصحيحين برقم (٢٤٩٢) وابن ابي شيبة في مسنده برقم (٥٣٠).، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الجامع الصغير للسيوطي برقم (٢٢٩٢) و سلسلة الصحيحة برقم (١١٠١) و قال حديث صحيح.

[٩٢]) ئیمامی نەوەوی رەحمەتی خوای لێ بێت بۆ خۆی شوێن کەوتەی ئیمامی شافعی بووە.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ڕۆژی جەنگی (حونەین) درعەکانی (صەفوانی کوری ئومەییە)ی بە (استعارە) وەرگرت، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: **((عارية مؤداة))**.[٩٣] واتە (عاری)یەکی پێدراوەیە.

وەلای سیرە نوسان سابت بووە کە(قزمان) ڕۆژی جەنگی ئوحود لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بەژداری جەنگەکەی کرد، وە (سێ)دانەی لە سەرانی موشریکان کوشت، وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی: **((إِنَّ اللَّهَ لَيَأْزُرُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ))**.[٩٤] واتە خوای گەورە ئەم دینە دەپارێزێت ئەگەر بە پیاوێکی فاجیریش بێت.

لە پێچەوانەی ئەمەشدا، زانایان خیلافیان هەیە لە بارەی کۆکردنەوە و ڕێك خستن لە نێوان ئەم فەرموودانەدا، کە ئیستیعانە بە موشریکان سەرەتا ڕێگری لێ کراوە، پاشان ڕێگەی پێدراوە.

حافظ ئیبن حەجەر لە (التلخیص)دا دەفەرموێت:

((وهذا أقر بها وعليه نص الشافعي)).[٩٥] واتە: شافعی دەنگی لەسەر ئەمە داوە.

چوار (مەذهەب)ەکەی ئەهلی سوننە پێك هاتوون لەسەر دروستی (ئیستیعانە) بە بێ باوەران بەڵام بە مەرجی خۆی:

١. (أن يكون حكم الإسلام هو الظاهر، أي يكون المسلمون أقوى من مجموع المشركين الذين استعانوا بهم والمشركين الذين يقاتلونهم، بحيث لو اتفق الكفار جميعا غلبهم المسلمون) بەو مەرجەی کە حوکمی ئیسلام بەسەریاندا زاڵ و ئاشکرا بێت، یان حوکم بۆ ئیسلام بێت، واتە بەو جۆرەی موسوڵمانان بەهێز تربن لە کۆمەڵی ئەو موشریکانەی کە (ئیستیعانە)پەنایان بۆ دەبەن، وە ئەو موشریکانەش کە دژیان شەڕ دەکەن، بەو جۆرەی

---

[٩٣]) صحيح: رواه الحاكم، وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الجامع برقم (٣٨٦٢).

[٩٤]) نيل الأوطار (٨/٤٤).

[٩٥]) نيل الأوطار (٨/٤٤).

ئەگـەر هــەموو موشـریکەکان یـەك بگـرن پێکـەوە، توانایـان نـەبێت سـەربکەون بەسـەر موسوڵمانەکاندا، واتە موسوڵمانەکان بتوانن سەرکەون بەسەریاندا.

٢. (أن يكون الكافر حسن الظن بالمسلمين وتؤمن خيانتهم، ويعرف ذلك من خلال معاملته) هــەروەها دەبێــت بــیٚ باوەڕەکــان گومــانی باشــیان بــە موســوڵمانەکان هــەبێت، وە موســوڵمانەکان پــارێزراوبن لــە خیانــەت و فــرت و فێڵیــان، ئەمــەش لــە ڕێگــەی هەڵــسو کەوتیانەوە دەزانرێت.

٣. (أن يكـون المـسلمون بحاجـة إلى الكـافر أو الكفـار المـستعان بهـم) موسـوڵمانەکان پێویستیان بە بیٚ باوەڕەکان هەبێت، ئەوانەی کە پەنایان بۆ دەبەن و داوای یارمەتیان لیٚ دەکەن.

## أ) ڕای حەنەفییەکان:

محمد کوری حەسەنی حەنەفی دەڵێت: (لا بأس بأن يستعين المسلمون بأهل الشرك على أهـل الـشرك إذا كـان حكـم الإسـلام هـو الغالـب).واتـە: هـیچ خراپەیـەکی تێـدا نییـە ئەگـەر موسوڵمانان پەنا بەرنە بـەر ئـەهلی شـیرك بـۆ کۆمـەکی کـردن دژی ئـەهلی شـیرك، ئەگـەر حوکمی ئیسلام بەسەریاندا زاڵ بێت و جێبەجیٚ بکرێت.

هەروەها (جەصاص) دەڵێت: (قال أصحابنا: لا بأس بالإسـتعانة بالمـشركين علـى قتـال غيرهم من المشركين إذا كانوا متى ظهروا كان حكم الإسـلام هـو الظـاهر).واتـە: هاوەڵـەکانمان وتویانە: هیچ خراپەیەکی تێدا نییە پەنا ببرێتە بەر موشریکان لـە دژی موشـریکانی دیکـە، ئەگەر هەرکاتێك موشریکان دەرکەوتن حوکمی ئیسلام ئاشکراو زاڵ بێت.

### ب) رای مالکییەکان:

ئیبن قاسم دەڵێت: (ولا أرى أن يستعينوا بهم يقاتلون معهم إلا أن يكون نواتيه أو خدما، فلا أرى بذلك بأسا).واتە: من وای نابینم کە موسوڵمانان پەنا بەرنە بەر موشریکان هەتا شان بەشانیان بجەنگن، واتە دروست نییە داوای یارمەتییان لێ بکەن، وە نابێت هاوکاری موسوڵمانان بکەن، مەگەر بە خزمەت کاری لەگەڵ موسوڵماناندا بن، بەم جۆرەیان هیچ خراپەیەکی تێدا نابینم.

هەروەها ئیمام مالیک بۆخۆی فەرموویەتی: (لا أرى أن يستعان بالمشركين على المشركين إلا أن يكونوا خدما).واتە: نابێت موسوڵمانان داوای هاوکاری لە موشریکان بکەن دژی موشریکانی دیکە، مەگەر بە خزمەت کاری لەگەڵ موسوڵماناندا بن.

### ت) رای شافعییەکان:

ئیمامی رومەیلی دەڵێت: (وللإمام أو نائبه الإستعانة بكفار ولو أهل حرب كأن يعرف حسن رأيهم فينا، ويشترط لجواز الإستعانة احتياجنا له لنحو خدمة أو قتال لقلتنا).واتە: پێشەواو نوێنەرەکەی بۆیان هەیە داوای کۆمەکی بکەن لە بێ باوەران، یان (ئیستعانە)یان پێ بکەن، ئەگەر ئەهلی جەنگیش بن، بەوەی بزانرێت رای باشیان هەیە لە بارەی ئیسلام و موسوڵمانانەوە، وە مەرجە بۆ دروستی پەنا بردن پێ یان، پێویستیمان پێیان هەبێت لە هاوکاری یان شەرکردن کاتێك موسوڵمانان کەم بن و دوژمن زۆربن.

### ث) رای حەنبەلییەکان:

ئیبن قودامەی مەقدسی دەڵێت: (وعن أحمد ما يدل على جواز الإستعانة بالمشرك، بل روي عن أحمد أنه يسهم للكافر من الغنائم إذا غزا مع الإمام خلافا للجمهور الذين لا يسهمون له).واتە: لە ئەحمەدەوە هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئیستعانە کردن بە موشریك،

بەڵکو لە ئەحمەدەوە ریوایەت کراوە کە کافران لە غەنیمە بەشیان پێدەدرێت، ئەگەر شان بەشانی پێشەوای موسوڵمانان بەژداری جەنگ بوون، ئەمەش لەگەڵ پێچەوانە و موخالەفەی جمهوری زانایان، کە دەڵێن بەشی پێنادرێت.

زۆربەی نوسەرەکان کاتێك لەسەر ئەم باسە دەدوێن دەکەونە هەڵەوە، دەقە قورئانییەکان دەکەنە بەڵگە بۆخۆیان، بەبێ ئەوەی قۆناغە مێژووی یەکانی دەقەکان بزانن، یان قۆناغی کاتی دابەزینی ئایەتەکان بزانن، دەبێت بۆ باس کردن لەم مەسەلە ئیلا قۆناغەکانی هاتنی دەقە جیهادی یەکانی قورئان بزانین، هەتا ئایەتی (سەیف) لە سورەتی (التوبة) دابەزی:

ئیبن قەییمی ئەلجەوزی رەحمەتی خوای لێبێت، قسەی لەسەر ئەوەیە کە جیهاد کردن لە قۆناغی مەککەدا حەرام بووە، پاشان کاتی هیجرەت رێگەی پێدراوە، پاشان فەرمانی پێکراوە یان واجب کراوە دژی ئەوانەی کە شەریان هەڵگیرساندووە لە سەرەتاوە، پاشان فەرمانی پێکراوەوە یان واجب کراوە دژی تەواوی موشریکان .

ئیبن عابدین (ابن العابدین) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت بزانە: فەرمان کردن بە شەڕکردن بە تەدریجی یان بە تەرتیب دابەزیوە، چونکە:

- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا فەرمانی پێ کرابوو بە بانگەواز و روو وەرگێڕان، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوو فەرمووی: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ (الحجر: ٩٤) واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) هەرچیت پێ سپێردراوە بەئاشکراو بێ پەردە ڕایبگەیەنە و ئاشکرای بکە، وە روو لە موشریکان وەربگێڕە و گوێیان مەدەرێ.
- پاشان خوای گەورە فەرمانی پێکردن کە بە وتو وێژو بانگەواز لەسەر چاکترین شێوە، پاش ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ (النحل: ١٢٥). واتە: ئەی پێغەمبەر، یان ئەی

ئیماندار، بانگەواز بۆ دینی خوای گەورە بکە، بە ئامۆگاری (قورئان) و چیرۆکە کانی قورئان و نمونەی چاك، وە هەموو کات بە چاکترین و شیاوترین شێواز بانگەوازیان بکە بۆ کەلیمەی (لاإله إلاالله)...

- پاشان خوای گەورە مۆڵەتی دان بەشەڕو قیتال کردن، ئەویش لەبەر ئایەتی: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾ (الحج٣٩)، واتە: بریار و مۆڵەتی تۆڵە کردنەوە دراوە بۆ ئەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سەپێنرا لەلایەن بێ باوەڕەکانەوە، چونکە ناهەقی و ستەمیان لێکراوە، بەراستی خوای گەورە بۆ کۆمەکی و یارمەتی دانیان زۆر بەتواناو بەهێزە.
- پاشان خوای گەورە فەرمانی پێکردن بەشەڕ کردن لە دژی بێ باوەڕان ئەگەر شەڕیان لەگەڵ کردن، پاش دابەزینی ئایەتی: ﴿ فَإِن قَـٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (البقرە: ١٩١). واتە: ئەگەر بێ باوەڕان لەگەڵ تان جەنگان، ئێوەش جەنگ یان لەگەڵ بکەن و بیان کوژن، سزاو تۆڵەی بێ باوەڕان هەر ئەوەیە.
- پاشان خوای گەورە فەرمانی پێکردن بە شەڕکردن دژی موشریکان بە مەرجی تەواو بوونی ئەو مانگانەی کە شەڕ کردن تێیدا قەدەغەیە، لەبەر ئایەتی: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ ﴾ (التوبة: ٥) واتە: پاشان کە مانگە حەرام و خاوەن ڕێزەکان برانەوە، ئەوانەی کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە (ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، رجب) ئێوەش لە هەر شوێنێکدا موشریکان تان دەستکەوت لە دەرەوەی حەرەم و، لە چوار مانگە حەرام کراوەکان و جگە چوار مانگەکەش بیان کوژن و لەناویان بەرن، وە بیان گرن و دیل یان بکەن، وە گەمارۆیان بدەن و ڕێگاکانیان لێ بگرن هەتا مەجالی راکردن یان نەبێت، وە لە هەموو کەمین و ڕێگەیەکدا بۆیان دابنیشن.

• پاشان خوای گەورە فەرمانی پێکردن کە بە گشتی و موطلەقی شەر دژ بە موشریکان بکەن لە هەموو کات و مانگەکاندا، ئەویش دوای دابەزینی ئایەتی ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ (البقرة۱۹۰)[٩٦]. واتە: ئێوە ئەی ئیمان داران شەڕو کوشتار لە پێناوی خوای گەورەدا بکەن دژ بەوانەی شەڕتان لەگەڵ دەکەن و لە دژتان دەجەنگن، وە ئاگادارین دەست درێژی نەکەن، چونکە خوای گەورە دەست درێژ کارانی خۆش ناوێت.

لەبەر ئەوە دەبێت ئیلا قۆناغەکانی کاتی دابەزینی ئایەتەکان بزانین:

دەبێت چاك ئەوەش بزانین کە بەهیچ جۆرێك نابێت و دروست نییە، کە دانوستانی سیاسی لەسەرەتای بانگەواز کردندا بکرێت، پێش ئەوەی بانگەواز دەسەلأت و کیانی خۆی هەبێت هەتا مەبدەئو بیرو باوەری خۆی تێدا بپارێزێت، ئەگەر بانگەوازی ئیسلامی لەسەرەتایەوە چووە ناو دانوستانی سیاسی یەوە، ئەوە بیرو باوەرو مەبدەئەکان تێك دەچێت و تێکەڵ و پێکەڵ دەبن و، تێگەیشتن و فەهمەکەی لای خەڵکی وون دەبێت، بانگەواز بە هەدەر دەچێت لە نێوانی یاری و گەمە سیاسی یەکان و کێشمە کێشەکانی ولأتان، ئەم ماوەش سورەتی ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴾ (الكافرون: ١ – ٣) وێنای دەکات، وە هەڵوێستی موسوڵمان تێیدا بەم جۆرە دەبێت ﴿ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ

---

[٩٦] ) تەواوی قسەکانی ئیبن عابدین بەم جۆرەیە: (إعلم أن الأمر بالقتال نزل مرتبا فقد كان رسول الله صلى الله عليه وسلم مأمورا أولا بالتبليغ والإعراض، يقول تعالى: {فاصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين}، ثم بالمجادلة بالأحسن، {أدع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن}، ثم أذن لهم بالقتال، {أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وإن الله على نصرهم لقدير}، ثم أمروا بالقتال إن قاتلوهم {فإن قاتلوكم فاقتلوهم كذلك جزاء الكافرين}، ثم أمروا بالقتال بشرط انسلاخ الأشهر الحرم، {فإذا انسلخ الأشهر الحرم فاقتلو المشركين حيث وجدتموهم}، ثم أمروا به مطلقا {وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلوكم ولا تعتدوا إن الله لا يحب المعتدين}).

يُبْصِرُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ (الاعراف ١٩٥-١٩٦) واتە: محمد (صلى الله عليه وسلم) بەو موشریکانە بڵێ: هاوار لە بتەکانتان بکەن و پەنای بۆ بەرن، پاشان بە هەمووتانەوە نەخشەو پلانی لەناو بردنم دارێژن، بە هیچ شێوەیەکیش مۆڵەتم مەدەن و چاوەڕێی هیچ شتێك مەکەن، بەراستی گەورە و سەرپەرشتیکاری من هەر ئەو خوایەیە کە ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە، وە هەر بۆ خۆشی چاودێری و سەرپەرشتی چاکە کاران دەکات.[٩٧]

## شروط عقد المعاهدة مع الكفار

## مەرجەکانی بەستنی پەیمان لەگەڵ بێ باوەڕان

زانایان ڕا جیاوازن لە بارەی دروستی بەستنی پەیمانی ئاشتی یان وەستانی شەڕ لەگەڵ بێ باوەڕاندا، هەندێك لە زانایان ڕێگەیان بەم کارە داوە، ئەمەش بەبەڵگە لەسەر پەیمانی صوڵحی حودەیبیە، وە هەشیانە ڕێگەی داوە ئەگەر موسوڵمانان زۆر لاواز بوون، وە هەشیانە کە بەهیچ جۆرێك ڕێگەی نەداوە بە پەیمانی ئاشتی، وە دەڵێن: ئایەتی (سەیف) هەموو پەیمانێکی لەگەڵ بێ باوەڕاندا پوچەڵ (نەسخ) کردۆتەوە.

**بەلام دەڵێین:** دروستە بۆ موسوڵمانان پەیمان لەگەڵ بێ باوەڕاندا ببەستن، ئەگەر بەرژەوەندی و مەصلەحەتێکی موسوڵمانانی تێدابێت، بەلام بەو مەرجەی کە نابێت پەیمانەکە مەرجێکی تێدابێت کە پەیمانەکە بەتاڵ بکاتەوە یان فاسیدی بکات، لەوانەش:

---

[٩٧] ) لا بد من إعلان المبادئ واستعلاء الدعاة حتى يصلب عودهم على نار المحنة، وتصقل أرواحهم في الصبر على الفتنة. وهكذا كان موقف رسول الله صلى الله عليه وسلم الواضح والصحابة معه في مكة المكرمة، أما بعد قيام دولة الإسلام فلا مانع من عقد المعاهدات.

١) (لا يجوز أن تتضمن المعاهدة شرطا فيه اعتراف أو إقرار الكفار بشبر من أراضي المسلمين) نابێت ئەو پەیمان نامەیە مەرجێکی تێدابێت بە دان پێدانان و ڕازی بوونی بێ باوەران بە بستێك لە خاکی موسوڵمانان..[٩٨]، چونکە خاکی ئیسلام موڵکی هیچ کەسێك نییە، هیچ کەسێك حەق و مافی ئەوەی نییە کە دانوستانی لەسەر بکات، بوونی ئەو مەرجە پەیمان نامەکە بەتاڵ دەکاتەوە، چونکە زەوی بۆ خوای گەورەیە و پاشان بۆ ئیسلام، هیچ کەس بۆی نییە کە مامەڵە بە موڵکی غەیری خۆی بکات، وە مرۆڤ بۆی نییە خاکێك بفرۆشێت کە هی ئەو نەبێت، وە لەبەر ئەوە لە بارەی روسەوە..[٩٩] دروست نییە دانوستان یان لەگەڵ بکرێت، هەتا ئەو کاتەی لە هەموو بستێکی خاکی ئەفغانستان پاشەکشە دەکەن و دەگەڕێنەوە، وە هەروەها لەگەڵ یەهودیش بەهەمان جۆر لە خاکی فەڵەستین...

٢) ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی عەین، ئەوە ئەو پەیمان و ئاشتی نامەیە بەتاڵ دەبێتەوە، وەك ئەوەی کاتێك دوژمنان بچنە خاکی موسوڵمانان، یان ئەگەر نیازی داگیر کردن یان هەبوو، لە (فتح العلى مالك) دا و لە باسی (الصلح والمعاهده فى المعيار) لە بابی (جیهاد) دا ئەم دەقە هاتووە: (أوقع الخليفة الصلح مع النصارى والمسلمون لا يرون إلا الجهاد فمهادنته منقوضة وفعله مردود)، واتە: خەلیفەی موسوڵمانان لەگەڵ نەصاراکان ئاشتی نامە دەکات، وە موسوڵمانان تەنها جیهاد هەڵدەبژێرن، ئەوە ئەو کاتە ئاشتی نامەکەی خەلیفە بەتاڵە و کارەکەی نا مەقبولە)). چونکە هەرکاتێك جیهاد لە شوێنێکدا بوویە فەرزی عەین ئەوە نابێت سوڵح و ئاشتەوایی بکرێت، واتە دروست نییە، هەروەك

---

[٩٨]) كتاب نهاية المحتاج (٨/٥٨).

[٩٩]) دیارە شێخ عبدالله عەزام رەحمەتی خوای لێ بێت، کاتێك ئەم کتێبەی نوسیبوو، کە شەری داگیر کاری یەکێتی سۆڤیەت بوو، واتە روسیا، ئەوکاتە لەلایەن ئەوانەوە ئەفغانستان داگیر کرابوو، بەڵام ئێستا سوپای ناتۆ و ئەمریکا داگیریان کردووە، بەو پێیە ئەم حوکمە ئێستا سوپای ناتۆو ئەمریکا دەگرێتەوە...کە سوپای ناتۆ پێك هاتووە لە کۆکراوەی و هاوبەشی (٤٥) وڵاتن.

چۆن دووژمن زاڵ بێت بەسەر موسوڵمانان دا، وە هەر شتێك وەرگیرابێت بۆ دیاری کردنی جیهادو تێکۆشان ڕێگرە لە بوونی ئاشتی و ئاگر بەست لەگەڵ دووژمندا، چونکە ئەو ئاشتی نامەیە پەیوەستە بە بەتاڵ کردنەوەی فەرزییەکی عەینی، کە ئەویش ئەو جیهادە پێویستەیەو، ڕزگار کردنی خەڵکی تێدایە.

قاضی ئیبن روشد نەقڵی (اتفاق) کۆرا دەکات لەسەر ئەوەی، ئەگەر جیهاد بوویە فەرزی عەین زۆر گرنگترە لە چوونە فەریزەی حەج، چونکە ئەگەر جیهاد فەرز بوو دەبێت دەست بەجێ جێبەجێ بکرێت، بەلأم حەج دەکرێت خاوی تێدا بکرێت، کە وابوو ئەو ئاشتی نامەو ئاگر بەستەی کە باس کراوە، پێویستە هەڵوەشێتەوە، چونکە بە حوکمی شەرع ئەو ئاگر بەستە دانەمەزراوە، بۆیە حوکمی ئەو ئاگر بەستە کاری پێناکرێت لای ئەو کەسانەی کە کار بە بنچینەو بنەماکانی شەریعەت دەکەن، وە ئەو ئاگر بەستەی کە باس دەکرێت واز هێنان لە جیهادی فەرزی عەینی تێدایە، وە وازهێنان لە جیهادی فەرزی عەین ڕێگری لێ کراوە، وە هەموو ڕێگە لێ گیراوێکیش کاری پێناکرێت.

٣) هەر مەرجێك ببێتە هۆکاری لەکار خستن و تەعطیلی شەریعەتی خوای گەورە، یان پشت گوێ خستن و ئیهمال کردنی دروشم و شەعائیرەکانی ئیسلام، ئەوە ئەو پەیمان نامە دانەمەزراوە و بەتاڵە، وە بەهیچ جۆرێك نابێت روسەکان دەست بخەنە رەوش و شێوازی حوکم و دەسەلأتەوە، چونکە ئەوە خراپ کردن و فاسدکردنی جیهاد و ئامانجەکانی یەتی.

بەهیچ جۆرێك نابێت ئەو گرێبەستە ببێتە هۆکاری لاواز کردنی موسولمانان، یان موسوڵمانان بەهۆیەوە هەست بەلاوازی و زەلیلی بکەن، وەك لە فەرموودەکەدا لە زوهریەوە هاتووە:

((لما اشتد على الناس البلاء بعث رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى عيينة بن حصن بن حنيفة بن بدر وإلى الحارث بن أبي عوف المزني –وهما قائدا غطفان– فأعطاهما ثلث ثمار المدينة على أن يرجعا بمن معهما عنه وعن أصحابه، فجرى بينه وبينهم الصلح حتى كتبوا

الكتاب، ولم تقع الشهادة ولا عزيمة الصلح إلا المراوضة، فلما أراد رسول الله صلى الله عليه وسلم أن يفعل ذلك، بعث إلى السعدين فذكر لهما ذلك واستشارهما فيه، فقالا: يا رسول الله أمراً تحبه فنصنعه، أم شيئاً أمرك الله به ولا بد لنا من العمل به، أم شيئاً تصنعه لنا؟ فقال: **((بل شيء أصنعه لكم، والله ما أصنع ذلك إلا لأني رأيت العرب رمتكم عن قوس واحدة، وكالبوكم من كل جانب، فأردت أن أكسر عنكم من شوكتهم إلى أمر ما))** فقال له سعد بن معاذ: يا رسول الله قد كنا وهؤلاء على الشرك بالله وعبادة الأوثان، لا نعبد الله ولا نعرفه، وهم لا يطمعون أن يأكلوا منها ثمرة واحدة إلا قرى أو بيعاً، أفحين أكرمنا الله بالإسلام وهدانا له وأعزنا بك وبه، نعطيهم أموالنا؟ ما لنا بهذا من حاجة، والله لا نعطيهم إلا السيف حتى يحكم الله بيننا وبينهم. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((أنت وذاك)) فتناول سعد بن معاذ الصحيفة، فمحا ما فيها من الكتاب)).

زوهری دەگێڕێتەوە: كاتێك ئابلۆقەی بێ باوەڕەكان ڕۆژی (ئەحزاب) پەرەی سەندو خەڵكی زۆر نارەحەت بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردی بە شوێن (عیینە بن حصن بن حنیفة بن بدر) و (الحارث بن أبي عوف المزني) كە دوو پێشەوای هۆزی (غطفان) بوون، كە پێغەمبەری خوا پێی ڕاگەیاندن ئەگەر ئەوان و هاواڵەكانیان بگەڕێنە دواوە و دەست لە ئابلۆقە دانی مەدینە هەڵبگرن ئەوە (سێ یەكی) واتە یەك لەسەر سێی بەرو بومی مەدینەیان پێدەدات، لەم بەینەدا بوون و خەریك ئەوە بوون كە پەیمانەكە بنوسن، بەلأم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كاتێك ویستی پەیمانەكە مۆر بكات ناردی بە شوێن هەردوو هاوەڵی بەڕێز: (سعد بن معاذ) و (سعد بن عبادة) كە گەورەی هەردوو تیرەی (ئەوس) و (خەزرەج) بوون، هەتا موشاوەرە و گفتو گۆیان لەو بارەوە لەگەڵ بكات، وە پێغەمبەری خوا بۆی ڕوون كردنەوە كە بە نیازی چییە، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە شتێكە پێت خۆشە كە ئێمە بیكەین، یان شتێكە خوای گەورە فەرمانی پێداویت بیكەیت و دەبێت هەر جێبەجێی بكەین، یان شتێكە خۆت ئەتەوێت بۆمانی بكەیت؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:

((ئەمە شتێکە خۆم بۆتانی ئەکەم، سوێند بەخوا تەنها لەبەر ئەوە دەیکەم چونکە من دەبینم عەرەب هەموویان لەیەك شوێنەوە لێتان دەدەن، وە لەهەموو شوێنێکەوە نارەحەت تان دەکەن، من ویستم ئەو هێزو شەوکەتەیان بەسەرتانەوە بشکێنم))

سەعیدی کوری مەعاز پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەوانە بووین کە شیرك مان دەکرد بە خوای گەورەو، بت پەرست بووین، خوامان نەدەپرست و نەمان دەناسی، ئەوان لەو کاتەدا نەیان دەتوانی دەنکە خورمایەك مان لێ بەرن مەگەر پێمان بفرۆشتنایە، کەچی ئێستا کە خوای گەورە ڕێزی لێناوین بە ئیسلام و، هیدایەتی داوین و، بەخۆی و تۆ بە عیزەتی کردووین، ئێستا ئێمە ماڵی خۆمانیان پێ بدەین؟ ئێمە پێویست مان بەوە نییە، سوێند بەخوا لە شمشێر زیاتریان پێ نادەین، هەتا خوای گەورە لە نێوانی ئێمە و ئەواندا حوکمی خۆی بەرقەرار دەکات، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیە وسلم) فەرمووی: تۆو ئەوە، ئیتر سەعدی کوری مەعاز پارچە پەرەکەی گرت و، نوسراوەکەی کە بەنیاز بوون مۆری بکەن کوژاندیەوە و سڕییەوە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەنصارەکان هەست یان کرد بەوەی کە ئەم پەیمانە زەلیل بوون و لاوازی ئەوانی تێدایە، هەربۆیە وتیان: ((**والله لا نعطیهم إلا السیف**)). واتە سوێند بەخوا لە شمشێر زیاتریان پێ نادەین.[١٠٠]

٤) هەروەها نابێت پەیمان نامەکە مەرجێکی تێدابێت کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامی بێت، بۆنمونە:

أ) دان پێدانان بە نیشتەجێ بوونی موشریکان لە خاکی پیرۆزی پێغەمبەری خوادا (صلى الله علیە وسلم)، چونکە وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە دەفەرموێت: ((**أخرجوا**

[١٠٠]) ئیبن ئیسحاق لە کیتابی (سیرە)کەیدا باسی کردووە بە دوورو درێژی، هەروەها ئیمامی (طەبەری)یش ئەمەی لە تەفسیرەکەدا باس کردووە، وە سەیید قوطب بەهەمان جۆر لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە، ئیبن (کەثیر)یش لە (سیرە) و (البدایة والنهایة) باسی کردووە...

**اليهود والنصارى من جزيرة العرب)).**[١٠١] واتە یەهود و نەصارا لە نیمچە دورگە (جەزیرە)ی عەرەبی وەدەرنێن.

ب) یان گەڕاندنەوەی ئافرەتێکی موسوڵمان بۆ بێ باوەڕان، چونکە خوای گەورە دەفــــــەرموێت: ﴿ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾ (الممتحنة١٠).

بەڵام گەڕاندنەوەی موسوڵمانی نێرینە بۆلای بێ باوەڕان، زانایان خیلاف یان هەیە لەبارەیەوە، هەندێك یان ڕێگەی داوە بە گەڕاندنەوەی ئەمیش بە قیاس کردن لەسەر پەیمانی حودەیبیە، بەڵام زاناو شارەزایانی دیکە بۆئەوە چوون کە دروست نییە پیاویش بگەڕێندرێتەوە، وە دەڵێن: پەیمانی (حودەیبیە) تایبەت بووە بە پێغەمبەری خوا خۆیەوە (صلى الله عليه وسلم)، چونکە دەیزانی کە خوای گەورە ڕێگا چارەی ڕزگار بوون یان بۆ دەنێرێت، وە ئەمەش ڕاسترە (والله أعلم).

لە بەرائی کوری عازەبەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: **((وادع رسول الله صلى الله عليه وسلم المشركين يوم الحديبية على ثلاث؛ من أتاهم من عند النبي صلى الله عليه وسلم لن يردوه، ومن أتى منهم ردوه، قال صلى الله عليه وسلم: من ذهب منا إليهم فأبعده الله)).** واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی پەیمانی حودەیبیە موشریکانی لەسەر (سێ) شت بەجێ هێشت، یەکەم: هەرکەس لای پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هات بۆلایان نەی گێڕنەوە، وە هەرکەس لەوان هات بۆ ناو موسوڵمانان بیگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەرکەس لە ئێمە ڕۆشت بۆلایان، خوای گەورە دووری بخاتەوە.[١٠٢]

---

[١٠١]) صحيح: رواه مسلم. الفتح الرباني (١٤/١٢٠).

[١٠٢]) متفق عليه.

٥) هەروەها ئەو پەیمانە نابێت دەرکەوتن و ئاشکراکردنی دروشمەکانی بێ باوەڕانی تێدابێت لە خاکی موسوڵمانانداا، وەك ڕێگە پێدانیان بە دروست کردنی (کڵێسە) و (دیر)ەکانیان، یان ڕێگە پێدانیان بە ناردنی کەسانی (تەبشیر)ی کە بیروباوەری خەڵکی خراپ و فاسد دەکەن، وە بەتایبەتیش لە دورگەی عەرەبیدا، وە هەر لەسەر ئەمەش ڕێگە چارەی سیاسی و دانوستان لە فەڵەستین باتڵە و بوتلاَنێکی بنەرەتی، کە هەرگیز ڕێگەی پێنادرێت....

بەلاَم لە ئەفغانستان دروستە بە کۆمەڵێك مەرج:

١. دەبێت روسەکان لە تەواوی خاکی موسوڵمانان بکشێنەوە.

٢. دەبێت دەوڵەتێکی ئیسلامی لە ئەفغانستان دامەزرێت، پاش ڕۆشتنی ئەو داگیر کەرانە، وە نابێت دەست بکەنە رەوشی دەسەلاَتەوە، وەك گەراندنەوەی مەلیك، یان دانانی هەندێك مەرجی (سەقاف) کە دەیەوێت بیرو باوەری خەڵکی ئەفغانی خراپ و فاسد بکات...

٣. دەبێت کشانەوەکەی سوپای روس (لە تەواوی خاکی موسوڵمانان) بەبێ هیچ مەرج و شەرت و کۆتێك بێت.

٤. دەبێت روسەکان دان بنێن بە موجاهیدەکان، یان داوای ئاشتی یان لێ بکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ (الانفال٦١) واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر دوژمنانی دینی خوا، مەیلی ئاشتەوایی و ئاگربەستیان کرد و ملیان راکێشا بۆی، تۆش دەتوانی قبوڵی بکەیت و، وەلاَمیان بدەیتەوە، بەمەرجێك بەرژەوەندی و سەروەری موسوڵمانانی تێدا بپارێزری، وە هەر پشت بە خوا ببەستە .[١٠٣]

---

[١٠٣]) روونکردنەوە: هەموو جۆرە ئاشتی و سازشێك لەگەڵ بێ باوەراندا حەرامە، بەلاَم بەو مەرجانە نەبێت کە شێخ عبدالله عزام باسیان لیوە دەکات، چونکە خوای گەورە لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا

ئیبن حەجەری (الهیثمی).[١٠٤] دەفەرموێت: ((والشرط الفاسد یفسد العقد علی الصحیح، بأن شرط فیه منع فك أسرانا، أو ترك ما استولوا علیه أو رد مسلم أسیر أفلت منهم، أو سكناهم الحجاز، أو إظهار الخمر بدارنا، أو أن نبعث إلیهم من جاءنا منهم)).[١٠٥] واتە: بوونی مەرجی فاسد و خراپ، پەیمانەکە بەتاڵ دەکاتەوە، بەوەی ئەگەر بێ باوەران بیکەنە مەرج بە ڕێگری کردن لە ئازاد کردنی ئەو دیلە موسوڵمانانەی کەلای ئەوان دەست بەسەر کراون، یان وازهێنان یان لەوانەی کە دەست یان بەسەردا گرتووە، یان گێڕانەوەی موسوڵمانێکی دیل کراوی هەڵهاتوو لە دەست یان، یان دانیشتن و نیشتەجێ بونیان لەخاکی (حیجاز)، یان دەرخستنی مەشروب لە خاکی ئێمەدا، یان بۆیان بگێڕینەوە هەرکەس لەوان کە دێت بۆلامان و باوەر دەهێنێت.

پاشان موجاهیدەکان دڵنیابن و یەقینیان هەبێت بەوەی کە روسەکان راست گۆن لە داواکردنی ئاشتیداو، فرت و فێڵ یان لەژێر سەردا نییە، هەر لەبەر ئەوە ئەوانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ ڕێگە چارەی ئاشتی و، دەیانەوێت ڕێگە چارەیەکی وەسەتی بگرنە بەر، بەبێ بانگەواز و راگەیاندنی ئامانجی جیهاد، (کە ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامییە)، بە بەهانەی ئەوەی کە وڵاتانی ڕۆژ ئاوا (غەرب) ئەمەیان پێ قبوڵ ناکرێت و،

---

إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴾ محمد: ٣٥) واتە: هەرگیز سست و لاواز مەبن لە کوشتاری کافران، وە داوای سازش و ئاشتیان لێ مەکەن لە ترسدا، لە کاتێکدا بە هێزی ئیمانەکەتانەوە ئێوە زاڵترن، وە خوای گەورەشتان لەگەڵە و بەتەنها نین)).

(قەتادە) دەفەرموێت: ئەم فەرمانی ئاگر بەست و ئاشتییە، پێش فەرمان بە جیهاد و، پێش دابەزینی ئایەتی: ﴿ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴾ (التوبة: ٢٩). بوو، واتە ئاگر بەست نەسخ بۆتەوە و هەردەبێت جەنگ یان لەگەڵ بکرێت. والله أعلم

[١٠٤]) خاوەنی دانراوی (الزواجر)ە ...

[١٠٥]) القرطبي (٣٩/٨).

بەرِوویدا دەوەستنەوە، ئەوانەی کە ئەمە کاریانە هیچ لە ئامانجی جیهاد تیِّ نەگەیشتوون، بەڵکو هیچ راو بۆچونێکی ئیسلامی ئاشکرایان نییە...

ئەوانە نابێت ببنە سەربازێك لە جیهاد دا، جا چجای ببنە پێشەوا و قادە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ ﴾ (التوبة ٨٣). واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) کاتێك خوای گەورە گەڕاندیتیەوە بۆ مەدینە، بۆلای، دەستەیەك لە مونافقەکان، ئەوانەی نەهاتن بۆ جەنگی تەبوك، دێنە لات، و داوات لیّ دەکەن مۆڵەتیان بدەیت لەگەڵ تۆ دەربچن و بچن بۆ غەزایەکی تر، واتە پەشیمانی خۆیان لە نەهاتنیان بۆ جەنگی تەبوك دەردەبرن، تۆش پێیان بڵێ: هەرگیز جارێکی تر لەگەڵ من نایەن بۆ جەنگ و جیهاد، ناشکرێت جارێکی تر لەگەڵ مندا بێن بۆ شەڕی هیچ دوژمنێك، چونکە ئێوە هەر لە ئەوەڵ ڕۆژەوە رازی بوون بە دانیشتن و، مانەوەتان لەماڵەوە هەڵبژارد و خۆتان دزییەوە و نەهاتن بۆ جیهاد، دە ئێستاش بچن خانە نشین بن و لەگەڵ ژنان و منداڵاندا بۆخۆتان لە ماڵەوە بمێننەوە.

ئیمامی (قورطبي) رەحمەتی خوای لیّ بێت دەفەرموێت:

((وهذا يدل على أن استصحاب المختل في الغزوات لا يجوز، وقد نص معظم الفقهاء في كتاب الجهاد على أنه لا يجوز أن يستصحب في الجيش مختل ولا مثبط ولا مُرجف ولا مُخذل ولا معوق)).

واتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەژداری کردنی کەسانی مونافیق و ترسنۆك لە غەزاکاندا دروست نییە، وە زۆربەی شارەزاو فوقەهاکان لە (کتاب الجهاد) دا دەنگ یان لەسەر ئەوە داوە کە نابێت کەسانی مونافیق و ترسنۆك و پشت هەڵکردوو، وە بێ کەڵك و کەم ئەندام لە سوپادا بەژداری بکەن...

خوای گەورە موجاهیدەکان لە ئەفغانستان و فەڵەستین و فلیبین و لوبنان و (عێراق و صۆمال و مەغریب و شام و یەمەن و شیشان و تورکستان و پاکستان و کشمیر و جگە ئەوانیش) لە هەموو شوێنەکاندا سەربخەیت، وە رایەی ئیسلام و حوکمی دەولەتی قورئان و ئومەتەکەمان لەسەر شاهادە لە پێناوی تۆدا سەربخەیت..

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين. والحمد لله رب العالمين
وصل الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه والتابعين
ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين

# وتەی کۆتایی

لە کۆتاییدا دەڵێین:

باسەکە بە زۆری نوسراوەکان و بوونی شاهیدەکان نییە، بەڵکو شتەکە پەیوەندی بە دڵەکانەوە هەیە، ئەگەر خوای گەورە نوری پێدا، ئەوە حەق دەبینێت و بۆی رون دەبێتەوە، خۆ ئەگەر دڵیش تاریك بوو ئەوە هەرگیز نابینێت: ﴿ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴾ (الانعام ١٠٤). واتە: بەراستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە چاوی هەقبین و، دڵی وشیارو، هۆی تێگەیاندن و، بەڵگەی رونتان بۆ هات، هەتا رێی راست بدۆزنەوە. جا هەرکەسێك رێی دەرکردو بەدڵ تێگەیشت و ئیمانی هێنا، ئەوە پاداشتەکەی بۆ خۆیەتی، هەرکەسیش لە ئاستی راستی یەکان چاوی دڵی کوێر بوو و ئیمانی نەهێنا، دیارە ئەوە هەر گوناهو تاوانەکەی دەکەوێتە سەرخۆی.

ئەو بینین و بەصیرەتەی کە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا باسی دەکات، لە دڵێکدا دەتەقێتەوە و دروست دەبێت کە دەرك بە شتەکان بکات و لە شتەکان تێبگات، ئەمەش بە کەسابەت و دیراسەت دەست ناکەوێت، بەڵکو ئەوە تەنها فەهم و تێگەیشتنێکە کە خوای گەورە دەیداتە بەندەیەکی لە تێگەیشتنی بۆ کتێب و دینەکەی، لەسەر ئاستی بینین و بەصیرەتی دڵی، ئەم بەصیرەتەش لە خاکی دڵدا گەورە دەبێت و پێدەگات و سەوز دەبێت، و دەتوانێت جیاوازی دروست بکات لە نێوان هەق و باتڵدا، وە درۆزن و راست گۆدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾ (الحجر: ٧٥) واتە: ئەوەی بەسەر ئەو گەلانەی پێش تۆمان هێنا لە سزاو تۆڵەی ئەوەی کردیان بە پێغەمبەرانیان، بەڵگە و نیشانە و پەندە بۆ ئەو کەسانەی دەبینن و تێ دەگەن و بیردەکەنەوە.

موجاهید دەفەرموێت: ((**للمتوسمين: أي للمُتَفَرسين**)). واتە: موتەوەسیم ئەو کەسانەن کە فیراسەت یان هەیە...[١٠٦]

ئیمامی ترمذی رەحمەتی خوای لێ بێت لە ئەبی سەعیدی خودری یەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**اتقوا فراسة المؤمن فإنه ينظر بنور الله**)).[١٠٧] واتە: خۆتان بپارێزن لە فیراسەتی باوەردار، چونکە ئەو بە نوری خوای گەورە تەماشا دەکات و دەبینێت.. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴾ (الحجر: ٧٥).

بەلاّم هەرکەس لە ئەهل و شوێنکەوتوانی عیلم شوێن دونیا بکەوێت و خۆشی بوێت بەسەر زانست و عیلمەکەیدا، ئەوە ئەبێت تەنها ناهەقی بڵێت، لە فەتواو حوکمیدا، چونکە حوکمەکانی خوای گەورە زۆربەیان لە پێچەوانەی غەریزەکانی خەڵکین، بەتایبەتیش ئەهل و شوێن کەوتوانی کورسی و رییاسەت...

ئەوانەی شوێن هەواو هەوەس کەوتون، هەرگیز غەریزەکانیان بۆ نایەتە دەست تەنها بە پێچەوانە و موخالەفە کردنی حەق و دوور کەوتنەوە نەبێت لێی، ئەگەر عالم و حاکم کورسی و پۆستیان خۆش ویست و شوێن هەواو هەوەسیان کەوتن، ئەوە هیچ یان لەوە دەست ناکەوێت تەنها بە دوور خستنەوە و روو بەرووی حەق نەبێت، وە بەتایبەت ئەو کاتەی ئەگەر شوبوهاتی بۆ دروست بوو، وە شوبوهاتەکەی لەگەڵ شەهەواتەکەی تێکەڵ بوو ئەوە هەواو هەوەس زاڵ دەبێت بەسەریدا، صەواب ون دەبێت و رووی حەقیش دەپۆشرێت لەبەر چاویاندا...

---

[١٠٦] ) سەیری تەفسیری طەبەری بکە...

[١٠٧] ) ضعيف: فەرموودەکە لاوازە، ئیمامی ترمذی و جگە ئەویش بە سەنەدێکی لاواز ریوایەتیان کردووە، شێخ ئەلبانی لە (سلسلة الضعيفة) و (ضعيف الترمذي) پلەی لاوازی پێداوە بە ژمارەی (٣١٢٧) ، وە دەفەرموێت فەرموودەیەکی صەحیح نییە. بەلاّم لە تەفسیری (قورطبي)دا هاتووە کە دەگێڕنەوە هاوەڵان کاریان پێکردووە (والله أعلم).

خۆ ئەگەر حەق ئاشکراش بوو، وە شاراوە نەبوو لە بەرچاویاندا، و هیچ گومانێکی تێدا نەبوو، ئەوە سەرپێچی یەکە پێش دەخەن بەسەر حەقەکەدا، وە دەڵێن: ڕێگەچارەی هەر دەبێت بە گەڕانەوە و تەوبە کردن، خوای گەورەش لەبارەی ئەوانە و هاو شێوەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴾ (مريم: ٥٩). واتە: لەدوای ئەو پێغەمبەرانە کۆمەڵێك لە کەسانی خراپ و لاسار بوونە جێگیریان، ئەمانیش یەهودی یەکان بوون، وازیان لە نوێژ هێناو بێ باوەر بوون بە خوای گەورە، وە شوێن هەواو هەوەس و ئارەزوو کەوتن، ئەوانە تووشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ (الاعراف: ١٦٨ـ ١٦٩) واتە: یەهودمان لە زەویدا پەرت و بڵاو کرد و، بونە چەند دەستە و بەستەی لێك ترازاو، کە هەیان بوو لەو دەستانە پیاو چاك بوو، هەشیان بوو چاك دەرنەچوو، بە خۆشی و ناخۆشی یان چاکە و خراپە تاقیمان کردنەوە، تا بگەڕێنەوە بۆلای خوای خۆیان و واز لە کوفر بێنن، کەچی لە پاشیانەوە جێنشینێکی بێ خێرو خراپە کار بەجێماو هاتە جێگایان، و کتێبی تەوراتیان گرتە دەست، کە هەر بۆ ماڵی ئەم دونیا تێ دەکۆشان، لە جێگای دواڕۆژ، ئەمە کاریانە و دەشڵێن: بێ گومان هەر زوو لەلای خواوە تاوانەکانمان دەبەخشرێت، واتە خوا لێمان خۆش دەبێت، خۆ ئەگەر دووبارە کاڵایەکی وەك ئەوەیان دەست کەوتبا، ئەگەر حەرامیش بوایە، ئەوەندە نەفس نزمن یەکسەر وەری دەگرن، ئاخۆ لە تەوراتدا پەیمانیان لێ وەرنەگیراوە، کە بەرامبەر

خودی خوا هەق نەبێت هیچ نەڵێن، ئەوەی لە تەوراتیشدا بوو هەمویان دیراسە کردبوو، کەچی هەر گوێیان نەئەدا، خۆ ماڵەکەی دیکە (قیامەت) بۆ ئەو کەسانەی لە خوا دەترسن باشترە لە لادان و ئەم دونیایەیان، ئیتر تێ ناگەن و ژیر نابن؟.[١٠٨]

بۆیە شوێن کەوتنی هەواو هەوەس دڵ کوێر دەکاتەوە، بەمەش هیچ جیاوازی ناکات لە نێوان سوننەت و بیدعەت دا، یان دڵی دەشکێت و پێچەوانە دەبێتەوە، بۆیە بیدعە بە سوننەت دەبینێت و، سوننەت بە بیدعە، ئەمەش بەڵاو ئافەی زانایانە ئەگەر شوێن دونیا و شەهەوات و کورسی و ریاسە کەوتن، ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الاعراف: ١٧٥-١٧٦). ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەنگو باسی ئەو کەسە سەر لێ شێواوەیان بۆ بخوێنە کە بەڵگەو نیشانەی خۆمانمان پێدا، کەچی خۆی لێ دارنین و یەخەی لێ هەڵتەکاندن، واتە خۆی بێ ئیمان کردو نەگەرایەوە بۆ هەق، پاشان شەیتان دوای هەنگاوەکانی خۆی خست، و چویە ناو ریزی گومرایانەوە، خۆ ئەگەر بمان ویستایە پلەی بەرزی مان بەو ئایەتانە دەدایەو، دوای ناهەقی نەدەکەوت، بەلام ئەو خۆی بە زەویدا نوساند و دونیای هەڵبژارد بەسەر دوا رۆژدا، و شوێن هەواو هەوەسی خۆی کەوت، و سەرگەردان بوو، نمونەی ئەو جۆرە کەسانە وەك ئەو سەگە هارە وایە، ئەگەر تاری بەیت و بۆی بچیت لە ماندویی خۆیدا زمانت لێ دەردەکێشێ و دەوەڕێت، خۆ ئەگەر هەر وازیشی لێ بهێنی و ئاوری لێ نەدەیتەوە، هەر زمان دەرئەهێنێ و دەوەڕێت بەڕووتا.

---

[١٠٨]) ﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ الأعراف: ١٧٠ - ١٧١

لەبەر ئەوە تەنها دەق و نەصە قورئانی یەکان بەس نییە، وە دەبێت ئیلا بەصیرەت و چاو رونی دڵ هەبێت، هەتا بەچاکی هەقی پێ ببینێت...

ئەگەر دڵ زۆر قاڵ بوو بە دونیاوە، وە تاوانەکانی نەفس زۆر بوون، هەڵیان دەگرێت و بەسەر دڵیەوە دەبێتە (ران)، چونکە هەموو تاوانێك دەبێتە پەڵەیەکی رەش بەسەر دڵەوە، بەردەوام ئەم پەڵەو نوکتانە بەسەر دڵەوە زیاد دەکات، هەتا ئەو کاتەی دەبێتە دڵێکی (ران) واتە ئەو دڵەی بۆتە یەك پارچەی رەشی، کە دەبێتە رێگر لەسەر چوونە ناوەوەی نور بۆناو ئەو دڵە ...

ئەو کاتەی دڵ تاریکی و رەشایی دای دەگرێت، وێنەی شتەکان وەك خۆی نابینێت، حەقی لێ وون دەبێت و وێنەکەی نابینێت، وە دڵیش پێچەوانە دەبێتەوە هەق بە باتڵ دەبینێ و باتڵیش بە هەق ...

بۆیە دەبێت بەندە تەقوایەکی چاك هەبێت، هەتا فورقان دەردەکەوێت، وە دڵ پاك دەبێتەوە و، وە شتەکان وەك ئاوێنە وەك خۆی دەبینێت بە روون و ئاشکرا، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (الانفال ٢٩) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر لە خوا بترسن و پارێزگاری لە فەرمان و بریارەکانی بکەن، نورێکتان دەداتێ بتوانن چاك وخراپی پێ لێك جیابکەنەوە و، رێ تان بۆ روون دەکاتەوە، وە گوناهەکانی پێشوتان ببورێت، و تاوانەکانیشتان ببەخشێ، وە خوای گەورە بۆخۆی خاوەنی بەهرەی زۆر گەورە و مەزنە بەسەر بەندەکانیەوە.

بۆیە پێشینان (سەلەف) ئەگەر شتێکیان لەسەر گران ببوایە و بۆیان چارەسەر نەکرایە، دەیان ووت: ((اسالوا أهل الثغور لأنهم أقرب الناس إلى الله)). واتە: بچن لە ئەهلی جیهاد و سەنگەرەکان بپرسن، چونکە ئەوان نزیك ترین کەسن لە خوای گەورەوە.

جارێکیان پرسیارێکیان کرد لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئایا ئێمە لە دوای خۆت لە کێ بپرسین، واتە پرسیار بەرینەوە بۆلای کێ؟ فەرمووی: لە ئەبو بەکری ئەلوارق بپرسن، چونکە ئەو وەرعی هەیە (کما يحسب) وە داوام وایە کە بۆ وەلام دانەوە مۆفەق بێت.

ئیمام بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێ بێت دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**قد كان فيما مضى قبلكم من الأمم أناس محدثون فإن يك في أمتي أحد منهم فهو عمر بن الخطاب** زاد زكرياء بن أبي زائدة عن سعد عن أبي سلمة عن أبي هريرة قال قال النبي صلى الله عليه وسلم **لقد كان فيمن كان قبلكم من بني إسرائيل رجال يكلمون من غير أن يكونوا أنبياء فإن يكن من أمتي منهم أحد فعمر**)).واتە: لە پێش ئێوەدا هەبوون لە (بەنو ئیسرائیل) پیاوانێك، قسەیان دەکرد و قسەکەر بوون، بێ ئەوەی پێغەمبەربن، ئەگەر یەکێك لە ئوممەتەکەی من هەبێت وەك ئەو پیاوانە، یان وەك ئەو قسەکەرانە ئەوە عومەرە. پاشان دەفەرموێت: ((**إن الله جعل الحق على لسان عمر وقلبه**)).[١٠٩] واتە: خوای گەورە هەقی ناردۆتە سەر دڵ و زووبانی عومەرەوە، خوای لێ رازی بێت. وە واتای وتەی (محدثون) واتە (مفهومون) تێگەیشتوان، یان راست گۆیان، ئەمەش لەبەر ئیخلاص و صدق و راستگۆیی ئیمام عومەر بوو، چونکە لە زۆربەی رووداوەکاندا وتەو پێش نیارەکانی لەگەڵ دەقەکانی قورئان دەهاتەوە.[١١٠]

وەك ئیمام موسلیم لە خاتو عائیشەوە خوای لێ رازی بێت دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا کاتێك شەو نوێژی دەکرد پاش (الله اكبر)و دابەستنی نوێژ ئەم نزای دەخوێند: ((**رب جبريل وميكائيل وإسرافيل فاطر السماوات والأرض عالم الغيب والشهادة أنت تحكم بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون اهدني لما اختلف فيه من الحق بإذنك إنك أنت تهدي من تشاء إلى صراط مستقيم**))....

---

[١٠٩] ) صحيح: ئەبو داود و نەسائی و ئیبن ماجە و ترمذي ریوایەتیان کردووە، شێخ ئەلبانی لە (صحيح الجامع الصغير و مشكاة المصابيح )دا پلەی صەحیحی پێداوە بە ژمارەی (١٧٣٦)...

[١١٠] ) هەربۆیە زانایان دەفەرمون: (٢٥) ئایەتی قورئان لەسەر تەصدیقی وتەی ئیمامی عومەر دابەزیووە.

## لەکۆتاییدا:

دەپارێینەوە بەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴾ الأعراف: ٨٩ وە بەردەوام ئەم نزا دەڵێینەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیوتەوە: ((أللهم اهدنا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنك إنك تهدي من تشاء إلى صراط مستقيم))...

﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ الحشر: ١٠

اللهم أحينا سعداء وأمتنا شهداء واحشرنا في زمرة المصطفى صلى الله عليه وسلم

وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

بە فەزڵی خوای گەورە تەواو بوو.

لە دوعای خێر بۆ ئێمە و موجاهیدەکان بێ بەشمان مەکەن

# ناوەڕۆك

# پرۆژەی ( باشترین هاوڕێ )
# بلاوکردنەوەی پەیام و بیری ڕەسەن و سەردەمیانە لە ڕێگەی کتێب و نامیلکەوە بۆ سەرجەم توێژەکان

بەرهەمەکانی پرۆژە

١ـ هاکا ئیسلام گەڕایەوە، (توێژینەوەیەکی کورتە لەسەر داهاتووی ئیسلام) نوسینی ئیکرام کریم.

٢ـ فەرهەنگی بانگخوازان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٣ـ بەرەو پەروەردەی ئیسلامی، نوسینی (ئەندازیار عوسمان)

٤ـ ڕامان لە قورئان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٥ـ بەخشین لە پێناوی خوادا، نوسینی (عەمر خالید) وەرگێڕانی (ڕوقیە صدیق).

٦ـمانای ناوە جوانەکانی خوا، وەرگێڕانی (م.عمر نیظامی).

٧ـ گەڕانەوە لای خوا (سبحانە وتعالی)، نوسینی: عەلی باپیر.

٨ـ نائومێدنەبوون لە سۆز و میهری خوایی، نوسینی ئەحلام حەمەشەریف

٩ـ بالاپۆشی، ڕێگرەکانی و مەرجەکانی:

١٠ـ بگە بە کاروان، نوسینی عبداللە عەزام، وەرگێڕانی باوکی عبدالرحمن.

١١ـ سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ)، نوسینی مەلا ئەحمەدی شەریعە.

١٢ـ سەروەرانمان لە مێژوودا، نوسینی د. مصطفی سباعی، وەرگێڕانی ڕوقیە صدیق.

١٣ـ مامۆستاکەم بەم شێوە فێری کردین ، نوسینی : د.عائض القرني ، وەرگێڕانی : ئامینە صدیق

١٤ـ تیرۆژنێك لە کەسایەتی و ڕەوشتی پێغەمبەری پێشەوا (محمد) ﷺ ، ئامادەکردنی : یاسین زەنگەنە.

١٥ـ سودەکانی هاوڕێیەتی پیاوچاکان، ئامادەکردنی: حەمزە بەرزنجی

١٦ـ تێگەیشتن و ئیجتهاد لە جیهاددا، نوسینی: د.عبداللە عەززام، وەرگێڕانی: هەورامان گەچێنەیی.

١٧ـ بەرگریکردن لە خاکی موسولمانان گرنگترین فەریزەی سەرشانی مسولمانانە، ن: د. عبداللە عزام. و. أبو صفوان.

(إن أصحاب الأقلام
يستطيعون أن يصنعوا
شيئاً كثيرا، ولكن بشرط
واحد: أن يموتوا هم
لتعيش أفكارهم، أن يطعموا
أفكارهم من لحومهم
ودمائهم، أن يقولوا ما
يعتقدون أنه حق، ويقدموا
دمائهم فداءً لكلمة الحق، أن
أفكارنا وكلماتنا تظل جثثاً
هامدةً، حتى اذا متنا في
سبيلها او غذيناها بالدماء،
انتقضت حية، وعاشت بين
الأحياء)

"سيد قطب"






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٨٦٨) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە